شیعــر

# که بووم به خۆڵ

نەوزاد ئەحمەد حسێن
nawzadbandy@yahoo.com

چاپی یەکەم
کوردستان
2005 زایینی – 2705 کوردی



بابەت: شیعر
ناوی کتێب: که بووم به خۆڵ
نووسەر: نەوزاد ئەحمەد حسێن – 07701435690
تایپ و دیزاین: کەمال عەبدولهادی
دیزاینی بەرگ: تابلۆی نووسەرن
باکگراوندی بەرگ: حەمەی کورم (تەمەن شەش ساڵ)
چاپ: چاپەمەنی سیما
تیراژ: 500
چاپی یەکەم: کوردستان، 2005 زایینی – 2705 کوردی
ژمارەی سپاردن: (259)ی ساڵی (2002)

## نان‌و خاك‌و گوڵ‌و سیاسەت

بە دوای نانێكا ئەگەڕێم، تەواو نەبێ
تاكو بەشی هەموو ئەوانەی لێبەم
كە بە نانێ كڕاون‌و
بە فیشەكێكیش ئەفرۆشرێن..
بە دوای خاكێكا ئەگەڕێم، تەواو نەبێ
تاكو هەموو ئەوانەی تیا نیشتەجێ كەم
بە شۆڕشێ كڕاون‌و
بە خدوختێكیش ئەفرۆشرێن..
بە دوای گوڵێكا ئەگەڕێم، هەڵنەوەرێ
تا بیدەم بەو شاعیرانەی
بە گوڵێ هەڵخەڵەتاون‌و
بە دڕكێكیش ئەكوژرێن..
بە دوای سیاسەتێكا ئەگەڕێم، پاشقول نەیخا
تاكو بە هەموو مرۆڤایەتی بڵێم:
ئێوە دەستێ كردوونی بە نیشانەو..
هەر بەو دەستەیش
بۆ نزیكترین بنكەی فریاكەوتن
هەڵئەگیرێن..

* * *

ئەچم بۆ بەشی جوگرافیا
ئەڵێم: دەریایەك بۆ نەخشەی وڵاتەكەم
زیاد كەن..
ناوی لێبنێن:
(دەریای خوێن)





## دوعا

خودایە،
خۆرێكی ترمان بۆ داگیرسێنە
ئەم تەنها خۆرە،
زۆر جێگای پشت گوێ خستووە
وەك ئەشكەوت‌و زیندانەكان..
وەك شانۆی سیاسەت‌و..
لیستی مووچەی سەركردەكان..
وەك گۆڕی شەهیدەكان..
خودایە،
دڵێكی ترم پێ ببەخشە
ئەم دڵەی خۆم زۆر تەنگەو..
كلیلی دەرگاكانیم ون كردووە..
خودایە،
چەند ئەستێرەیەكی ترمان
بۆ تەئسیس كە
بە ئاوو هەواو كانزاكان..
ئەم ئەستێرەیە پڕە لە شەڕو..
هەر بەشی چەند كەسێ ئەكا..
خودایە،
مرۆڤ دونیای تێكداوە
بۆچی لەجیاتی ئەو،
مەملەكەتێ خاڵخاڵۆكەو
پەپوولەو
چۆلەكە، ناهێنیتە دنیاوە..؟

بۆچی وەك دیناسۆر
مرۆڤ ناسڕێتەوە..؟
مرۆڤ: ئەو شتە گلاوە..
بۆچی وەكو دیناسۆر
ئەو تۆخمە نابڕێتەوە..؟
مرۆڤ: ئەو دڕندەیەی
تا مردن خەریكی ڕاوە..
خودایە،
تەمەنی من زۆر درێژە..
حەزم لە تەمەنی
لاولاوە..
خودایە،
بە ئیجازەی خۆت،
بمكە بە چڵە گیایەك،
تەمەنم بەهارێ بێ‌و
وڵاتم گوڵزارێ بێ..
بمكە بە شنە بایەك،
تەمەنم پیاسەیەك بێ‌و
وڵاتم ڕووبارێ بێ..





## یەك قاڵب سەهۆڵی جەنگ[1]

دەست درێژ مەكە، مردوو، شەیتانیش وازی لێدێنێ
سەهۆڵ، هەتاویش شەرمی لێ ئەكا..
(ئەی جەنگ، سەگ نەبووم، ڕاوت پێكردم)
تا دەستت تەزی شەڕە تۆپەڵت بە ژەهر كرد، تۆ
تا دەستت سووتا شەڕە مەمكۆڵەت بە شەكر كرد، تۆ..
(وەكو پشیلە خۆی فڕێدایە حەوشەكەمان، جەنگ..
چووە سەربان‌و
(LNB)ی قەدی سەحنەكەی فڕان
وتی: لەمەودوا بۆ من بڕوانن..)
ئەی جەنگ سەگ نەبووم، پاست پێكردم
تا دەستت تەزی شەڕە فیشەكت بە بەفر كرد، تۆ..
(ئەی جەنگ، چاوەڕێم لە دەرگا بدرێ‌و
لەجیاتی پسووڵەی ئاوو كارەبا،
شەهادەی وەفات بدەنە دەستم..
چاوەڕێم بڵێن:
ئامادەباشیت تیایە بێیتە ژێر ڕەحمەتی پۆستاڵ؟
زەحمەتی پۆستاڵ..؟
ئامادەباشیت تیایە زەردەپەڕ بەجێ بهێڵی‌و
لە ئەشكەوتێكا ببی بە كەڕوو؟
ئەی جەنگ كە عەسران ئەمبەی بۆ گەڕان
كۆشكەكان یەك یەك ئەبن بە چادر
كچ ئەبێ بە بەرد

[1] ئەم شیعرە لە ژمارە (57و 58و 59و 60)ی گۆڤاری (ئایندە)دا بلاو نەكراوەتەوە..

منالْ ئەبێتە بۆیاخچیی پێلاو..
ئۆتومبێلەکان ئەبن بە تانك‌و
شەقامەکانیش ئەبن بە ساتر..
ئاسمان بە دووکەڵ ئیدمان ئەبێت‌و
گوڵ ڕەدووی شارای تەمموز ئەکەوێ..
دێراو پڕ ئەبێ لە قوڵپی ئاگر..
قاقا پێکەنی‌و.. پێی وتم: چی تر
ئەی جەنگ ئەو شەوەی لەتەکما ئەنووی
تا بەرەبەیان
من هەر گۆڕەوی سەربازی ئەشۆم
لە بازگەیەکا ئەژنۆم وشك ئەبێ
دۆش دائەمێنم، ئەڵێی چیمەنتۆم..)
ئەی جەنگ سەگ نەبووم، تۆنی وەڕینت بۆچی فێرکردم
(سەرداری مێژووی چاپ ئەکرد ئەمڕۆ..
ئەیووت: ڕۆمان‌و چین‌و یۆنان‌و
هیندو ئەندەلوس، موڵکی بابم بوون، بگرە زیاتریش..
ئەیووت: ناپلیۆن من دەرسم دادا..
وتمان: چی تریش..؟)
دارو هەلوکی لە منالەکانی گەرەك وەرگرت‌و
تیرو کەوانی لـێ دابەش کردن.. بێ ویژدانتریش
بەردی هەلّماقۆی لـێ فڕاندن‌و
قەوانی ڕەشی فیشەکی دانێ.. بێ ویژدانتریش
گوێم لە گۆرانی داواکراو ئەگرت،
کاتێ جەنگ سیمی کارەبای پچڕان، لەناکاوتریش..
گوێم لە هەناسەی یاری ئەگرت کاتێ





هێڵی تەلەفۆنی بە فیشەك پسان، لەناکاوتریش..
(وەك چۆن جگەرە دائەگیرسێنی..)
(ئەمڕۆ سەرداری فەلسەفەی ئەکرد،
ئەیووت: میکی ماوس گەر تەشریف بێنێ
یەکڕاست ئەیکەم بە قائید فەیلەقێ..
ئەگەر دۆنکیشۆت دڵی پێوە بێ،
ئەیکەم بە وەزیری بەرگری‌و پۆلیس..)
ئەی جەنگ سەگ نەبووم، لە چوار دیواری ماڵ دەرتکردم
بەندە بە نەعلی ئیسفەنجەوە بووم
کە جەنگ پێی وتم: هۆو! ماندوو نەبی..
(وەك لابردنی کاسکێتی گوێزێ، یان ئاسانتریش..
نیوەی کەفاوی ڕیشم هەر مابوو،
کە جەنگ مەکینەی ڕیش تاشینەکەی لێوەرگرتم‌و
دەستی گرتم‌و..
چاوی بەستم‌و.. ناوی نام: جوندی)
ئەمڕۆ سەرداری
وانەی بیرکاری شەرح ئەکرد بۆمان..
ئەیووت: پۆستاڵ‌و
بەدلەی زەیتوونی‌و
بیری ڕەش‌و لار = قائید
سەربازی لات‌و
چەپلەی زۆرەملـێ‌و
گەمی ئوسترالیا = وڵات..
خەڵك‌و
حەیوان‌و

دارو
جنۆکە یەکسانن بە من..
(وەك ئۆینێ تاوڵە..
پێش وەرزی باران،
جلی خاکییان دا بە چۆلەکەو
لەقلەقێکیشیان لەناکاو کرد بە رەئیس عورەفا)
من بە بیجامەو باوێشکەوە بووم، بردیانم بۆ جەنگ، لەناکاوتریش..
منالەکانم بۆ (تۆمو جێری) پێئەکەنینو
داپیرەم تەشی خول ئەدا کاتێ جەنگ لە دەرگای دا..
نوقڵی جەژن لە گیرفانما بوو،
فیشەك ئەژنۆمی بە سوخرە گرتو.. بێئاگاتریش..
چاوەڕێی دێڕێ هەڵبەستم ئەکرد
کە بەیاننامەی جەنگ هاتو.. وتی: بمخوێنەوە.. دەی..
(ئەی جەنگ، دانیشتووی ژوورێکی "کرێ"م
جلی خاکییان لەبەر کردمو..
وتیان: خاکەکەت..
وتیان: وڵاتەکەت لە خەتەردایە..
وتم: کام وڵات؟..
نانێ.. دیناری لە ماڵما نەبوو
کواشیکۆر[*] ئێسکی منالەکانمی یەك بە یەك ژمارد
جوعبەی خاکییان کردە پشتمو
وتیان: سامانو کۆمپانیاکانت..
وتم: کام سامان؟
دز.. پیاوکوژ.. قەحبە..

---

[*] کواشیکۆر: نەخۆشی بەدخۆراکی.



کە بووم بە خۆڵ

گەواد.. درۆزن،
وەك کوللە زەردە، ئارامیان خوارد..
کلاشینکۆفێ کرایە شانمو..
وتیان: ئەمنی قەومی لە خەتەردایە..
زستان بە خەڵوز سەرمامان ئەشکان..
یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن کوشتینی..
کە بیرییەکیان تەپاندە سەرم،
وتیان: بیرە نەوتەکان با داگیر نەکرێن!
ئەی جەنگ سەگ نەبووم، کۆتو زنجیرت بۆ کردە ملم؟
نەگەیشتبوومە دەرکی ماڵەوە،
بۆنی بارانو نانم لێئەهات،
کە جەنگ شانێکی لێدامو.. وتی:
(بۆستە.. ئەم دۆستەت پێبناسێنم..
– ئەمە مردنە..
– ئەوەیش سەربازی ونی ئەمجارە..)
کە تەوقەمان کرد، دەستم وشك بوو..
(بە بەیانیانا کێوە چم، ئەی جەنگ؟
شەقام سلاوی تیا نەما، لاڵ بوو.. گۆڕستانتریش
ئێواران وێڵم.. بۆ لای کێ بڕۆم، ئاوارەتریش..)
سەردار مەدالیای ئاڵتوونی بەخشی بە سنگی تیاترۆ..
سەرهەنگێ موورووی شینی بە شانی خۆیا داکوتی
سەرتیپ لە قاتی حەوتەمی مێژوو..
کە گەیشتە قاقای هەشتەمی شەهوەت،
بۆ ژنی سێیەم،
چوار شیش فەرهادو

دوو کوپ شیرینی بانگ کرد، سەیرتریش..
(لیّت زویر نابم، جیّم بیّڵە ئەی مەرگ..
تا دەستت رەش بوو، شەرە دووکەڵت بە هەور کرد، تۆ..)
یەك دڵۆپ ژنم لـەگەڵدا نەبوو، بێ لانەتریش..
شەکری چایەك، شیعرم پێنەبوو..
(ئای دڵی جەنگمان چۆن پێ نەرەنجا)
جەنگ توورەکەیەکی خستە ژوورەکەم،
کردمەوە "پیری" توند یەخەی گرتم.. لـەناکاوتریش..
هەردوو دەستی کرد بە دڵماو.. "یار"ی رفاندو.. وتی:
لـە بەرەکانی جەنگ ئەتدەمەوە..
هەردوو دەستی کرد بە گیرفانمداو
کلیلـەکانی ماڵەوەی رفان..
وتی: لـە تەجنید بۆتی دائەنێم..
هەردوو دەستی کرد بە کاری کۆتاو.. ساواکەی بردین..
وتی: بێ خەم بن، سواڵی بارووتی پێئەکەم بۆ خۆم) بێ
ئەخلاقتریش..
هەردوو دەستی کرد بە داهاتووما، چی تیابوو دزی..
هەردوو دەستی کرد بە رۆحماو.. وتی: بەهەشتیش بۆ تۆ..
ئەی جەنگ سەگ نەبووم، کەرووە نانێکت وا بۆ فرێدام..
(شاعیرێ ئەڵقەی بەنی ئەکردە براتووتەی یار..
سەرداریێ بە بای جنێو پێگەیی..
بە دوو کیسەڵی ماندووی پیرەوە،
بە تەکما رابورد.. لـەپڕ مرانی:
– جەنگت باش.. هاوڕێ..)
سەرداریێ سەری لووتی خۆی بیر چوو..





وەك مێش داشبولـێی شێرێکی پیس کرد..
لـەپڕ پێی وتین: جەنگتان باش، هاوڕێ..
جا لـە هۆڵێکی تەوجیە سیاسی، نەڕانی، وتی:
(خۆشترە تامی جەنگی ئەمجارە لـە تامی نوێنی کچی چواردە ساڵ..
بگرە شیرینتر.. بگرە بەرینتر.. بگرە چاوشینتر لـە ئاسۆی خەیاڵ..)
ئەمەی وت سەردار..
قومێ یادگاری لێوم تەڕ ئەکەم..
بە کراسی کچێکی عەیارا رژام
کە جەنگ تەلبەنی لێدابەش کردین،
ئەو یەکسەر شووی کرد بە سیاسەتو
منیش بووم بە ژێر پێی عەسکەرەوە، بێ پەیمانتریش..
هێشتا کچێکم ماچ نەکردبوو،
کە ئەڵقەم کردە براتووتەی جەنگ
ئەو جزدانێکی کردە گیرفانم
کردمەوە لـەتێ ئێسقانی تیابوو، ناشیرینتریش..
ئەڵقەی نارنجۆکی کردە پەنجەی من، بێ ویژدانتریش..
(ئەی جەنگ نەفەسێ هەتاوم ئەوێ، زیندان کوشتمی..
ساتێ چاکەتی نیلـلـیو پانتۆڵی خۆڵەمێشی، کوا..؟
ئێوارەیەکی کۆڕنیشی، دیجلـە لـە کوێ ئەفرۆشن؟
خەونێ بۆ زانکۆ، لـە کام شەو بڕنم؟ پیری کوشتمی..)
سەرداریێ حەزی لـە میکانۆ بوو..
حوشترو خانووی دروست ئەکردو
ئەیشێرووخاندن.. وەکو فێگرتوو، لـەپڕ قیڕاندی:
– جەنگتان باش، گەلۆ
سەردار پەنجا ساڵ

بەردی هاویشت بۆ نەخوێنەنەواریو
کەچی بۆی نەشکا..
خەڵکی چاوەڕێی رەحمی سەردار بوون،
پێكو
گڵاسو
لەگزس دابەشکا..
شاعیرێ شیعری پەمپەرسی نووسی
بۆ نێو لنگانی ساوای سەرداریێ.. بگرە زیاتریش..
(جەنگ لەسەر شەقام کفنی هەڕاج کرد..
لافیتەی رەشو
کراسی رەشو
قەڵەمی دەستی بەفری هەڕاج کرد
جەنگ بە قێزەوە بۆ پۆلـێ مراویی
ناو دیجلەی روانیو..
بە حەسرەتەوە گۆڕێکی ماچ کرد..
جەنگ براکانمی،
بە ئەورووپادا بڵاو کردەوە..
پەنجا ساڵ تەشیی خێزانمان رێسا،
جەنگ بە چرنوکێ
ریسەکەمانی خاو – خاو کردەوە..)
چەن دڕکاوی بوو باڵی پەپوولە
پوولەکاوی بوون پەڕەکانی گوڵ..
بۆ هێندە کورت بوو رۆمانی بەفر؟
بۆ وا درێژ بوو وتاری ژەهر؟
(لێت زویر نابم جێم بێڵە، ئەی جەنگ..





تا دەستت شل بوو، شەرە درەختت بە تەور کرد، تۆ..)
هەنگاوێ گۆچان لە خۆم زیز ئەکەم
بەیانی سەیری ئاوێنە ناکەم
ئێوارە زەنگی تەلەفۆنی جەنگ، بەرز ئەکەمەوەو
ئەڵێم: ببوورە نمرەکەت هەڵە خولاندۆتەوە
جاڵجاڵۆکەیەك دەکەم بە دڵدار،
لە لۆکەی خۆڵاوی، ماڵێ ئەچنینو
بە هەرزان عومر هەڕاج دەکەمو.. بێ هیواتریش..
ئەبمە هاوسەری پیرەژنێکی
شەستو پێنج ساڵەی هۆڵەندیو لە ناو
پێستی تاریكو چرچو لۆچیدا
لە دووی مرواری لجووو ئەگەڕێم.. بێ ئەخلاقتریش..
ئەی جەنگ سەگ نەبووم، ئەو هەموو ساڵە بۆ برسیت کردم؟
(هاتنە ژوورەوە،
زەرداوی چاوی چراکەمیان رشت
خەونەکانمیان پۆستاڵاوی کرد..
پەڕەی شەوبۆیان دووکەڵاوی کرد..
ئۆلیڤەر تویستیان باروتاوی کرد.. بێ ئەخلاقتریش..
پڕ بە چەپۆکی ورچێکی کێوی، شیعریان رنی..
هێندەی زەنگیانەی جزدانەی دایکم
دەرزییان کرد بە دیموکراسیاو.. ناماقوڵتریش..
سەرهەنگێ یۆگای هەر بۆ نەئەکرا،
چی کتێبی یۆگا هەبوو سووتانی
فەرهەنگێ وشەی تیا نەما بۆ خوێ
ناچار پڕیانکرد لە نانو پەنیر..

هێلکەو بەتانی..)
سەردار گرامیێ کەرامەت، کەمتر..
نیو هەنگاو شمشێر..
نیو نەفەس بڕیار..
نیو ڕێ ئەسپەشێ..
تۆزێ ڕۆژو شەو، قەرز ئەکا لێتان —
هیچ کەس نایداتێ —
منالێ بە فلّچە هەتا بالآی خۆی
کردی بە پێلاو،
شاعیرێ،
داستان
ئەفسانە
ڕۆمان
نوقلآنەو
شیعر..
بۆنەو
جەژنانەو
چی بوو، بەشی کرد.. لەوە سەیرتریش..)
هێشتا بەیانی باوێشکی ئەدا،
لەگەڵ سەموونا چەکیان دا پێمان، ناوەختتریش..
هێشتا ناوێکمان بۆ ساواکەمان نەدۆزیبۆوە،
دەفتەر خیدمەیان بۆ پڕ کردەوەو
بە فلّچەی دووکەڵ، هی بیرە نەوتێ،
چاوەکانیان ڕشت، بێ ویژدانتریش..
(یان خۆشەویستی وەك منالێ بوو زۆڵو بێ باوك..



که بووم به خۆڵ

وەك تاکێ کەوشی بۆگەنو دڕاو.. یان ڕیسواتریش..)
(لێت زویر نابم، جێم بێڵە ئەی جەنگ
تا ترێ سیس بوو شەڕە سێدارەت
بە کەپر کرد تۆ)
ئاخر ئاگر بۆ دارستان ئەخوا؟
بۆچی تاریکی چرا قووت ئەدا؟
هەستامو.. وتم:
(بێ شەرمە دووکەڵ..
بارووت، بێ حەیا..
پۆستاڵ، بێ حورمەت)
ئاخر ئاگر بۆ دارستان ئەخوا؟
ئەی جەنگ سەگ نەبووم، لە کەلاوەیەك لە یادت کردم..
هێشتا کانیلە تینوێتی ڕێی لێوەرنەگرتبووم
جەنگ بیابانی لە گیانما ڕواند، دڕندەتریش..
بە دیاری قاتێ جلی بۆ هێنام، گیرفانی نەبوو
لە کۆشکێ دانام، نە دەرگای هەبوو..
نە کلاورۆژنە، ژێر زەمینتریش..
دەستی گرتمو
بە پیاسە بردمی بەرەو گۆڕستان.. یان پیاوکوژتریش..
دەستی گرتمو
بۆ عیدی میلاد شارێکی کرد بە قالبێ کێكو
ڕیزێ منالّی برسی داگیرسان یان مەغۆلتریش..
هێواش پێی وتم: جیاوازی چییە لە نێوان سەری
بیبسیو منالا، کاتی هەڵپچڕین.. یان هیتلەرتریش؟
جیاوازی چییە لە نێوان بالۆنو دلّی پڕ لە خوێن، کاتی کونکردن.. یان

پیاوکوژتریش..
(سەردار لـه قورنەی شەقامی پاییز
خەریکی سواڵی فیکەو چەپڵە بوو..
پاییز لـه قورنەی شەقامی سەردار
لـه هەر بستێکا تفێکی ئەکرد..
بە دەستێ تاپڕ گڕ ئەدا سەردار
بە قاچێ سەما، بێ دەماغتریش..
وتم: وابزانم ئیتر تەواو بووی..
نوزانی، وتی: (بەڵێ)کان بۆ من.. دۆنکیشۆتتریش..
ئەم جەژنە یەکەم میوانم جەنگ بوو، قەت داخم ناچێ..
پێش ئەوەی جەژنانە بەم بە کورەکەم، جەنگ لێی وەرگرتم..
پێش ئەوەی قەیسی جەژن پێبگا
جەنگ پێگەیشت هاتە سەر سفرەکەمان..
بە دەستخەتێکی خوارو ناقۆڵا
بە ڕەنگی سوتوو،
لـه دەرگاکەمان نووسی: (بژی من..)
ئەی جەنگ مناڵی هاروهاج نەبووم
پەنجەت داخ کردم..
سەگی گێژ نەبووم، گوێچکەت قەل کردم
ئەی جەنگ خۆ گۆشتی ئێکسپایەر نەبووم
ئەم مۆرە چی بوو دات لـه تەوێڵم
لەلات سەیر نەبێ
گەر فانیلەکەم بکەم بە ئالاو..
چەکو..
دروشمو..





تۆ بەجێ بێڵم.. لەلات سەیر نەبێ
کاتێ چووم بۆ ژوان،
جەنگ لـه پێش یار گەیشت..
زستان تەواو بوو،
جەنگ پێش بەهار گەیشت..
دار ئەرخەوانێ قومێ هۆنراوەی بە جەنگا ڕشتو
کەچی نەخنکا..
خاك مشتێ خۆڵی کرد بەسەر جەنگاو
هەر دانەمرکا..
مناڵەکەم بە خەتکوژێنێکی پەمەیی و بۆنخۆش
ویستی وشەی جەنگ بکوژێنێتەوە..
جەنگ بە قامچییەك دەستی زامدار کرد..
جا بە دووکەڵی ڕەشی پایپەکەی
نووسی: (ژیان بۆ من)
بە یاسای ئاسن..
بە فەلسەفەی گڕ
ئێوە هەمووتان کەرەسەی خۆمن.
قەت داخم ناچێ، جەنگ مناڵانی فێری تووتن کرد..
شەقامی پڕ کرد لـه کەمئەندامو
مزگەوتەکانی پڕ کرد لـه سواڵکەر..
برسێتی خستە سەر پەرەی نانو
تینوێتی خستە ناو لێوی ڕووبار..
قوتکەکانی کرد بە گۆڕستانو
کۆشکی پڕ کرد لـه سیاسەتمەدار
چایخانەکانی پڕ — پڕ کرد لـه شێت..

شیعر لـه کەمپا دەرپێکەی ون کرد..
کۆمپیوتەر بوو بە تەسبیحی قەزوان..! دواکەوتووتریش..
ماکیاژی بۆ رووی کەرکەدەن کردو
باڵی بە پەپوولـەی کرد بە کەلاوە.. بێ ئەخلاقتریش..
قیناعی ویقایەی فێری ژنانی شارەکەمان کرد:
(پڕ کەوچکێ خوێ، کەوچکێ خەڵوز..)
ناوی وەزیری بەرگرییەکانی هەموو جیهانی
فێری منالّی ناو کاریکۆت کرد..
جەنگ مینی خستە جێگای پیشۆکو
خەردەلی خستە جێگای ئۆکسجین..)
بە ساوایانی باخچەکانی وت:
(منالاّن ئیتر مەیەن بۆ ئێرە..
باخچەکان ئەکەم بە ریزێ زیندان.. بێ ئەخلاقتریش..)
بە هۆنراوەی وت:
(چاپخانەی شەعب ئەکەم بە تەجنید.. بێ ئەخلاقتریش..)
بازاڕی میوەی کرد بە بازاڕی چەك.. خراپتریش..
(لـە نیوەی شەوا بیرم کەوتەوە،
جەنگ لـەودیو دەرگای حەوشە وەستاوەو
منیش دیلێکی زامداری جەنگم..
لە نیوەی خەوا بیرم کەوتەوە
جەنگ لـەودیو دەرگای توبیی عەدلییەو
منیش لـە ژوورێ
تەنها قالّبێ سەهۆڵی جەنگم.. ساردوسڕتریش..
مەنووسە (خائین)، مردوو شەیتانیش وازی لێدێنێ..





## دڵـم خۆش نییە

بە شەقامەکانا ئەڕۆمو.. دڵـم خۆش نییە..
لـە دەرگا ئەدەمو.. دڵـم خۆش نییە..
نان ئەخۆمو..
پیاڵـەیەك چا ئەخۆمەوەو..
لـەسەر شاشەی تەلـەفزیۆن بۆ دیموکراسی ئەڕوانمو.. دڵـم خۆش نییە..
باران ئەبارێو.. دڵـم خۆش نییە..
گوڵ ئەپشکوێتو..
پەپوولـە باڵی بە یەکا ئەداو.. دڵـم خۆش نییە..
پێئەکەنمو.. دڵـم خۆش نییە..
کچێك پێم ئەڵێ: شیعرەکانتم لـەبەر کردووەو..
کوڕێ پێم ئەڵێ: بە شیعرێکی تۆ یارێکم گرتو.. دڵـم خۆش نییە..
ریش ئەتاشمو..
عەترێکی هەرزان لـە خۆم ئەدەمو.. دڵـم خۆش نییە..
پێلاّوەکانم بۆیاخ ئەکەمو.. دڵـم خۆش نییە..
دۆلار ئەفڕێتو.. دڵـم خۆش نییە..
دۆلار ئەشکێتو.. دڵـم خۆش نییە..
بەعس راوی نایە، دڵـم خۆش نەبوو..
بەعسمان راو نا، دڵـم خۆش نییە..
دڵـم خۆش نییەو.. لـە ناو کۆڕێکا باوێشك ئەدەمو
نوکتەیەکی نوێ بۆ هاوڕێیەکم ئەگێڕمەوەو..
پێئەکەنێتو.. دڵـم خۆش نییە..
شیعرێکم لـەلای سەرنووسەرێکی لـووتبەرز ون ئەبێو..
یەکێکی ترم بە چاپ ئەگاتو..
یەکێکی تریش بە بێ پرسی خۆم ئەکرێ بە گۆرانیو.. دڵـم خۆش نییە..

دڵـم خۆش نییەو.. لە بەردەم دوكانێكی لەنگە فرۆشا
كراسێكی كۆن تەماشا ئەكەم..
دڵـم خۆش نییەو.. لە توولـە رێیەكی پاركی ئازادی
وەك ئاو لایدابم،
سڵاوی هاورێیەك ناسەنمەوەو
بیتاقەیەكی یانەسیب ئەكڕم،
ئەگەر دەریشچێت، دڵـم خۆش نییە..
جگەرەم ئەكێشاو.. دڵم خۆش نەبوو..
دە ساڵ جگەرەم تەرك كردو.. دڵـم خۆش نەبوو..
سێ رۆژە جگەرەم هەڵـگرتۆتەوەو.. دڵـم خۆش نییە..
هاورێیەكی كۆن ئەدۆزمەوەو..
بیست ساڵ پێش ئێستا یاد ئەكەینەوەو.. دڵـم خۆش نییە..
لە پەنایەكدا یەخەی خۆم ئەگرمو
بە خۆم ئەڵێم: لە ئەوروپایش بیت، دڵت خۆش نییە..
دڵـم خۆش نییەو..
رۆژەكانم وەك توێكڵە گوڵەبەڕۆژە
لەسەر زەوییەكە پەرتو بڵاون..
ژنەكەم ئەڵێ: با گسكی لێبەم..
ئەڵێم: زەحمەتە..
ئەچم بۆ سەیران، دڵـم خۆش نییە..
ئەچم بۆ سەر كار، دڵـم خۆش نییە..
رۆژی هەینییەو..
دە سەعات خەوتوومو.. دڵـم خۆش نییە..
دراوسێكانم زۆر لێم رازینو.. دڵـم خۆش نییە..
هەژار بووم، دڵـم خۆش نەبوو..
ئێستا فێری خەواندنی پارە بوومو.. دڵـم خۆش نییە..





دڵـم خۆش نییەو.. دڵـم خۆش نییە..
بە چی بڕوا ئەكەن، سوێندتان بۆ ئەخۆم، دڵـم خۆش نییە..

## دۆلارستان

ئای! دۆلار چەند خێرا
دابەش ئەکرێ‌و..
چەند بە نهێنی، هەڵئەگیرێ..
لـە ژیانمدا،
منالّی ونو
مردووی بێ ناوو نیشانم، بینیوه..
پەنجەی شکاوو..
سەری بڕڕاو..
دڵی وەستاوم بینیوه..
کەچی هێشتا
دۆلارێکی بێ خاوەنم
لـە سیلـەی ڕێگایەکا نەبینیوه..
خانووی رووخاوو..
دیناری لـەت لـەت کراوو..
ژنی سووتاوم بینیوه..
کەچی هێشتا
دۆلارێکی دڕاوم نەبینیوه..
چەن ئازیزە دۆلار..
چەن بە نازە دۆلار..
ئەوانەی دۆلاریان هەیە،
لـە دوورەوە دیارن..
لـە بینایەکی تازە تەعمیرکراو ئەچن‌و..
پەنجەکانیان وەك هی بووکەشووشە، پەمەیین..
گۆرەوییەکانیان وەك هی پەپوولـە، ئاوریشمین..





ددانەکانیان وەك عاجو فسفۆر، تیشکهاوێژن..
چەن بەڵایە دۆلار..
شەمشەکوێرە ئەکاتە کەناریو..
دڕکەزی ئەکاتە گوڵەمێخەك..
منالّی چڵکن‌و
ژنی بۆگەن‌و
پیاوی مێشاوی‌و
دیناری گریساویم بینیوه..
کەچی هێشتا دۆلارێکم نەبینیوه
ئوتووی پانتۆڵەکەی شکابێ..
یان تەسریحەی پرچی شێوابێ..
چەن بێ رەحمە دۆلار..
یەکسەر شەقامەکان پڕ ئەکا لـە مازداو
شۆستەکان پڕ ئەکا لـە عەرەبانە..
یەکسەر دەوڵەمەندو هەژار جیا ئەکاتەوە..
یەکسەر نیوەی وڵاتەکە ئەکاتە کۆشك‌و
نیوەکەی تری چادری پینە پینە..
یەکسەر لایەکی شار ئەکاتە کۆمپانیاو
نیوەکەی تری ئەکاتە بازاڕی لـەنگەو
بۆیاخچیو.. مەزادخانە..
من دارستانی سووتاوو..
نانی سووتاوم بینیوه..
کەچی هێشتا
دۆلاری سووتاوم نەبینیوه..
(دوعا بکە بۆ ئەوانەی دۆلاریان نییە..

خوایە گیان! رەحمێ بکە بەو گیرفانانەی
هێشتا دۆلاریان تاقی نەکردۆتەوە..
خوایە گیان! میهرێ بۆ ئەو خێزانانەی
هێشتا نازانن دۆلار چی لـێ نووسراوە..
خوایە گیان! چاوێ بخشێنە بەو ژنە شەهیدانەی
کە کەلـلـەی فرانکلینو کەلـلـەی سەرۆکێ،
لـە یەکتر جیا ناکەنەوە..
ئامین.. یا رب العالمین..
من دیناری دوو رەقەمو
حیزبی دوو رەقەمو
شاری دوو رەقەمو
گوندی دوو رەقەمم بینیوە..
من سیاسی دوو رەقەمو
ئوتومبێلی دوو رەقمو
کۆتری دوو رەقەمم بینیوە..
من ئاگری دوو رەقەمو
مەلای دوو رەقەمو
کۆمۆنیستی دوو رەقەمو
شاعیری دوو رەقەمم بینیوە،
کەچی هێشتا دۆلاری دوو رەقەمم نەبینیوە..
چەند ئوسوڵییە دۆلار..
چەند سەلـەفییە دۆلار..
کە هاتە شارەکەمان،
چەپڵەمان بۆ لێدا، کەچی شەپقەکەی دانەگرت..
کە هاتە گوندەکەمان،





رەیحانەمان تێگرت، کەچی سڵاوێکی نەکرد..
زۆر سوپاس ئەی دۆلار..!
من سەربازی ونو
میللـەتی ونو
کەشتی ونو
ئاڵتوونی ونم بینیوە..
کەچی دۆلاری ونم نەبینیوە..
زۆر سوپاس ئەی دۆلار..!
بە پیاوی قەڵەوت ئاشنا کردین،
ئەو پیاوانەی تەنانەت ناتوانن قونی خۆیشیان بسڕن..
فێری ئەوەت کردین، بە چاو سەیر کەینو
هیچی تر..
فێری ئەوەت کردین، ئیش بکەینو.. هیچی تر..
فێری ئەوەت کردین سێ ژەم بخۆینو.. هیچی تر..
فێری ئەوەت کردین کێوی بێستونت بۆ کون بکەینو
پەشیمانیش نەبین..
فێری شتی تریشت کردین کە عەیبە لاپەڕەکانی
شیعری پێشێوینم، وەك:
. ... ... ...
. ... ... ...
. ... ... ...
. ... ... ...
سەربازی ونو
نیشتمانی ونو
رابوردووی ونو

خۆشەویستی ون، گۆڕیان هەیە..
تەنها دۆلار گۆڕی نییەو
قەت ون نابێ..
شەڕی جەبهەی شیماڵو
شەڕی عوروبەو
شەڕی تەحریری کوێتو
شەڕی ناوخۆو
شەڕی غەوغائیو
شەڕی براکوژیم بینیوە..
هەروەها شەڕی دۆلاریشم بینی..
چەند بە رەحمە دۆلار..
لە شەڕا بەشداریمان ئەکاو..
فێری بەکارهێنانی چەکە قورسەکانمان ئەکا..
حیسار ئەشکێنێو..
لەو سنوورانەی کە لاعیبەی منالّی لـێ ئاودیو نابێ
تانكو..
راجیمەو..
جێبی قیادەمان بۆ دێنێ..
سوپاس بۆ دۆلار..
چەپڵەیەکی سارد بۆ دۆلار..





## كە بووم بە خۆڵ[*]

كە مردمو.. بووم بە خۆڵ
ئەگەڕێمەوە بۆ گەڕەکی منالّیم..
لـەو پاسكیلانە ئەنیشم
كە باوكم نەیتوانی بیانكڕێ بۆم..
لـەو درەختانە ئەنیشم
كە میوەی زەردو سووریان ئەگرتو
باوكم نەیئەتوانی بیانكڕێ بۆم..
لـە مامۆستایەتی ئەنیشم
كە نەیئەهێشت باوكم گیرفانی پڕ بێ..
كە مردمو.. بووم بە خۆڵ
چیدی خەم ناخۆم..
خەم بارگەی لـە هەر جێیەك خست
سواری پشتی با ئەبمو
ئەو جێیە بەجێدێڵـم..
كە بووم بە خۆڵ
ئەڕۆم بۆ سەربازگاكان
ئەچمە چاوی ئەو ئەفسەرانەوە
كە چێژ لـە ئازاردانی مرۆڤ ئەبینن..
ئەچمە چاوی ئەو سەركردانەوە
كە ساڵانە جارێ یان دوو جار

---

[*] پێشکەشە بە عێراق.

ئەم شیعرە لـە گۆڤاری (ئاینـدە) ژمـارە (50 – 51)دا بـلاّو کراوەتـەوە.. دوای ئـەوە بـرادەرێکم سـوێندو قورئـانی بـۆ خـواردم کـە لـە کـەناڵی دووی سـەحەری ئێرانـدا خوێندراوەتەوە، من خۆم نەمبینیوە بخوێندرێتەوە چونکە بە راستی ئاگام لـەو کەناڵە نییە.

جلی خاکی‌و پۆستاڵ ئەکەنە بەری نیشتمان..
هەرمێ ئەکەن بە نارنجۆك‌و
گێلاس ئەکەن بە فیشەك..
دارگوێز ئەکەن بە تابووت‌و
لووتکە ئەکەن بە گۆڕستان..
مین ئەخەنە جێی پیشۆك‌و سێوی بن عەرز..
که بووم به خۆڵ
چیدی برسێتی.. ناتوانێ یەخەم بگرێ‌و
دوگمەکانی ژیانم دانە دانە بپسێنێ..
چیدی نەخۆشی ناتوانێ کانیۆلا بکاتە باڵمەو
لە قاوشێکی شێداری نەخۆشخانەیەکی میری بمخەوێنێ..
چیدی خەو ناتوانێ لە دیتنی مانگ‌و ئەستێرەی
بەرەبەیان بێبەشم کا..
سیخوڕ ناتوانێ ڕاپۆرتی چوار لاپەڕەییم لەسەر بنووسێ..
چیدی هەنار ناتوانێ زارم پڕکا لە ئاو..
چیدی بەرزبوونەوەی دۆلار دڵم تەنگ ناکا..
که بووم به تۆزو خۆڵ..
لەو دەرگایانەوە ئەچمە ئەودیو
که هەرگیز لە ڕوومدا داخرا بوون..
لەو پەنجەرە تاریکانەوە دزە ئەکەم
که پیاوە گەورەکانی لە ئێمە شاردبۆوە
تیایدا کۆنکەنیان بە چارەنووسی من ئەکرد
تیایدا دۆمینەیان بە شیری منالْ ئەکرد..
تیایدا سێ ڕسکێنیان بە سامانی نەتەوایەتی‌و..
دامەیان بە مێژوو ئەکرد..





ئەچمە ناو کۆبوونەوە داخراوەکان
ئەو کۆبوونەوانەی تیایدا بڕیاری
نەوت‌و.. جەنگ‌و.. خوێنیان ئیمزا ئەکرد..
ئەڕۆم.. ئەو سنوورانە ئەبڕم
که هەرگیز نەمئەتوانی بیانبڕم..
لە پەنجەرەو میناکانی ئەورووپا ئەنیشم..
ئەو ئەورووپایەی ڕازی نەبوو پەنام بداو..
پەنجەمۆرەکانمی
بە بازاڕی یەکگرتووی ئەورووپادا بڵاو کردەوە..
چیدی جەندرمە ناتوانێ بمگرێ‌و
دارکاریم کاو.. سنوورداشم کاتەوە..
چیدی دۆلار ناکەم بە کەپسوڵ‌و.. قووتیان نادەم..
چیدی ناتوانن کەلەپچەو.. قولاپ‌و.. زیندانم پێ تاقیکەنەوە..
چیدی پۆلیس ناتوانێ داوای هەویەم لێ بکا..
چیدی ڕەفیق حیزبی ناتوانێ قوڕی پێڵاوەکانی
بە بەر سمێڵەکانم پاك بکاتەوە..
چیدی حەسار.. ناتوانێ کتێبەکانم پێ بفرۆشێ..
که مردم‌و.. بووم به خۆڵ
لە درزی دەرگاکەتانەوە ئەچمە ژوورێ..
لە کەزیەکانت ئەنیشم..
بۆ ئەوەی بریق‌و باقیان نەمێنێ..
ئەچمە ناو هەناسەکانتەوەو
لەگەڵ یەکەم کۆکەتا
لە ناو دڵتا ناوی خۆم ئەدۆزمەوە،
که بە دزییەوە هەڵتگرتبوو..

به خەتکوژێنێکی دڕکاوی ئەیکوژێنمەوە..
لە رووی ئاوێنەکەت ئەنیشم
بۆ ئەوەی هەرگیز خۆت بە بێگەردی نەبینی..
که مردمو.. بووم به خۆڵ
چیدی پێویستم به رۆژنامەو گۆڤارەکان نییه..
به هەزار منەت دوو کۆپلە فرمێسکم بۆ چاپکەن..
خۆم شیعرەکانم بلاو ئەکەمەوە..
لە هەموو جێیەك ئەیانخوێنمەوە..
به هەموو کەسێکیان لەبەر ئەکەم..
پێویستم به هۆڵو.. بلندگۆو.. کورسی نییه..
پێویستم به خەلاتو.. ماچو.. چەپلە نییه..
لە قوتابخانەی ئەییوبیەی سەرەتایی ئەڕۆمە ژوور..
دلم نایەت لە هیچ جێگایەك بنیشم
لەگەڵ فەڕاشەکەدا،
پەڕۆیەکی تەڕ هەلئەگرم
زەمینی پۆلەکان ئەسڕمەوە..
دەرسی پێنجەم
مەلهەمی تتزاسایکلین
ئەکەمە چاوی منالە چاو کزەکان..
لەگەڵ دەستەسڕێکدا
فرمێسکی ئەو قوتابیانە وشك ئەکەمەوە
که مامۆستایەکی ناحالی لێیداون..
سوپاسی مامۆستای سروود ئەکەم،
که فێری شاخی سەوزو بەرزی گۆیژەی کردین..
چیدی پێویستم به پرسگەو.. تەلەفۆنو.. نامە نییه..





پێویستم به دەرگاو.. دیوارو.. بنمیچو.. ئاگردان نییه..
پێویستم به سەعاتی کارەباو.. باوەشێن نییه..
ئەچمە هێلانەی چۆلەکەیەك
هەتا دایکیان به دەنووکی پڕەوە دێتەوە
لایلایە بۆ زەرنەقووتەکان ئەکەم..
که بووم به خۆڵ،
چیدی پێویستم به کراسو.. بۆینباخو..
پانتۆڵ نییه..
پێویستم به عەتری سیگارو..
سەعاتو.. جگەرەو.. ئوتوو نییه..
چیدی لە دەی مانگەوە قەرز ناکەم
چیدی لە بیستی مانگەوە چاوەڕێی مووچە ناکەم
چیدی بۆ دوو ژووری کرێ ناگەڕێم
چیدی سیاسییەکانو.. بازرگانەکانو.. قاچاخچییەکان
ناتوانن دەستم ببڕن.. ئەچمە چاویان..
چیدی بەقالە چاوزەقەکان
ناتوانن تەماتەی رزیوم به نرخی تەماتەی زەلاتە پێبفرۆشن..
ئەچمە چاویان..
چیدی ئەنیستیتوی کورد لە پاریس
به نیازی زەمالەی خوێندن
ناتوانێ هەتا ئەنکەرا بمباتو..
لەوێ لە شەقامی ئولۆس
لە ئوتێلی ئیلهان.. لە نهۆمی دوو،
به نائومێدی بەجێم بێڵێ..
ئەچمە لای کەندالڵ نەزان،

بزانم بۆچی وەڵامی نامەو..
ئیمەیڵەکانی نەدامەوە..؟
کە مردمو.. بووم بە خۆڵ
گوڵـلە ناتوانێ مێشکم بپژێنێ..
چەقۆ ناتوانێ دڵم بپێکێ..
سیانید ناتوانێ بمخنکێنێ..
بازگە ناتوانێ راموەستێنێ..
فسفۆر ناتوانێ بمسووتێنێ..
دەبابە ناتوانێ ئابڵووقەم با..
فڕۆکە ناتوانێ ناپاڵمم بۆ بهاوێ
ئینزیبات ناتوانێ ئیهانەم بکا
چیدی پێویستم بە قەڵەمو..
بە کاغەزو.. بە چاویلکەو.. بە دڵداری نییە..
پێویستم بە دەستو.. پەنجەو.. چاو نییە..
کە مردمو بووم بە خۆڵ..
ئەچمە درزی سەربانی ماڵە هەتیوێ
کە نە بانگێڕو.. نە بانگردێنیان هەیە..
ئەچمە چاوی ئەو کەسانەی لـە هیچو خۆڕایی مۆڕە ئەکەن..
جارێکی تر وشکەساڵی نابینم..
محەویلـەکەمان ناتەقێ..
موەلیدەکەمان ناسووتێ..
مەعاشەکەمان ناوەستێ..
لـە رۆژانی مەنعە تەجەولـدا،
بە ئارەزووی خۆم ئەسووڕێمەوەو
بە فیکە سیمفۆنیایەکی مۆزارت ئەژەنم..





ئای! ئەو کاتەی بووم بە تۆزو خۆڵ
دڵـم نایەت نزیکی مناڵەکان ببمەوە..
ئەوان رقیان لـە خۆڵـەو..
هەر کە لـە دایك ئەبن،
چاوەکانیان هەڵئەگڵۆفن..
ئای! مەخابن.. کە ناتوانم لـە مناڵان نزیك ببمەوە..
ناچار ئەچم بۆ موسڵ..
بێ هەویە.. بێ تەزکیە..
بێ دەفتەر خیدمە..
بێ بەرتیل، هەموو بازگەکان ئەبڕم..
ئەچم بۆ کۆلـیژی زانستی..
بەشی بایۆلـۆژی..
نهۆمی سێ..
لـەوێدا.. تەنها لـەوێدا
دەست ئەکەم بە گریان..
چونکە هەرگیز ئەو هەموو قوتابییەی
کە شانزە ساڵ کۆمکردنەوە،
پێم کۆ ناکرێنەوە..
کە وەك خەناوکەیەك پچڕانو..
بە چوارقوڕنەی دنیادا بڵاو بوونەوە..
کە گریایشم، ئەبمە چنگێ قوڕو..
کاو گوزارێکی لاوازی میسری
بە فلـچە گسکم ئەداو..
وشك ئەبمەوەو..
ئەبمەوە بە خۆڵ..

## به ڕۆژی نیوەڕۆ(*)

( 1 )

پێویسته دنیا بڕوخێ، یان درز ببا..
پێویسته مەرگ ڕێم پێبگرێ،
یان شانێکم لــێ با..
کوا لیژنەی مافی درەخت،
بۆ گۆڕی به کۆمەڵی ڕەگو ریشه باس ناکا؟
به تەنیایی، ئێوارەیەکیان
تانەم لـه ژیان ئەدا..
گوێم لـه ترپەی دڵـم ئەگرت
ماسولـکەو ئێسقانەکانم
میکرۆبگەلێك چاوەڕوانیان ئەکا..
ئەوان به بێ دەنگ
به بێ ڕەنگ
به بێ ڕەزامەندی یوئێن،
هەموو جەنگەکان ئەبەنەوە..
ئەوان به بێ فیشەك
به بێ توبی عەدلی
هەموو کاسەی سەرەکان ئەکەنەوە
ئیتر ئێمه چین؟!
ئێمەی دەبەنگ..!

( 2 )

لـه کەلاوەیەکدا..

(*) (منیش لـه شتی گەورە بێزارم      شەیدای شتی بچووکم، دلـشاد عەبدوڵلا).





دوو سێ سیاسی
دەرپێی شیعرێکیان داکەندبوو..
خ ە ر ی ك ی بوون..
لـه مەیدانێکدا
دوو سێ چەکدار
پۆستاڵێکی ڕەقەم نۆی ڕۆمانییان
کردبووە پێی کۆپلـه شیعرێ..
لـه مەزادخانه
دوو سێ جامباز
شیعرێکیان لـەگەڵ مسو فافۆن
تێکەڵاو کرد..
لـه کۆڵێتی بازگەیەکا
سەگێ لـەبەر بێ ئێسقانی
پەنجەرەی شیعرێکی شکان
بەرهەیوانێکی گلاو کرد..،
شیعری بێ گرەنتی
شاعیری بازرگان..
دەقیقەیەك به بێ دەنگی ڕاوەستن
بۆ پەیکەری
پەڕۆی
گ ی ر ف ا ن..

( 3 )

بەزەییم به خۆمو.. دوژمنەکەما دێتەوە..
لـەسەر سێوێك شەڕ ئەکەین،
نیوەی سیسو..

نیوەی تری خوراوە..
لەسەر شەرەفێ شەڕ ئەکەین
بێ شەرەفێ دایناوە..
لە دونیایەکا بە دوای دەسەڵاتا ئەگەڕێین،
کە وەك هەڵماتێ، فڕێ دراوە..
بەزەییم بە خۆمو.. دوژمنەکەما دێتەوە..
لەسەر خاکێك شەڕ ئەکەین،
کە گۆڕی هەردووکمانی تیا هەڵکەنراوە..
لە ئیمپراتۆریەتێ ئەگەڕێین،
لە مۆزەخانە، کەڕوو تێیداوە..

( 4 )

بیر ناکەمەوە لە مانگ
لە سەمای شەوانی..
ئەستێرەیەك بووە بە یارم
شەو تا بەیانی
بیر ناکەمەوە لە جەنگ
لە چەكو بەرەکانی..
بیر ناکەمەوە لە دنیا
لە فەیلەسووفو..
ك ە ر ە ك ا ن ی..
شیعرێك بووە بە هاوڕێم
ئەیکەم بە شەکری دیژلەمەکانم
جارجار ئەینووسمو..
جارجار ئەمکوژێنێتەوە..
جارجار ئەیدڕێنمو..





جارجار ئەیکەم بە گۆرانی..
زۆرجاریش لە پرسگەی رۆژنامەیەکا
دەستو قاچی وشك ئەبن،
هەو ئەکەن جومگەکانی..
سەرنووسەرێکی لووتبەرز،
سڵاوەکەی ناسێنێتەوە..
بیر لە سیاسەت ناکەمەوە
منالێکم هەیە
میزی هات، میزی پێئەکەم..
وشەیەکی تازە فێر بوو
چەپڵەیەکی بۆ لێئەدەم..
شەویش تا خەوی لێئەکەوێ
پشت ئەکەمە خەیاڵو..
رووی تێئەکەم..

( 5 )

هەندێ ئێوارە..
ئەکەومە دوای وشەیەکی دڵشاد عەبدوڵڵا
نازانم بە نوکی قەڵەم نووسیوێتی
یان بە لوولەی دڵ..
هەندێ بەیانی
ئەکەومە دوای کچێکی بەرەڵڵا
نازانم بۆ دائیرە ئەچێ
یان چاوەڕوانی هۆڕنی مازدایەکن، گوێچکەکانی(*)

(*) ئەم شیعرە لە ژمارە (47)ی گۆڤاری (ئاینده)دا بڵاو کراوەتەوە.

## بەرگی چیا(*)

کێ ئەزانێ،
بەرگی چیا بێجگە لە بەرد، چ بەرگێکە..؟
بەفرو ڕەشەباو سەرمایە
گەرمیو تیشكو ڕووناکییە..
لێڕەوارە.. گژوگیایە..
کۆختی قوڕە.. تاریکییە..
خاكو خۆڵە..
گیانەوەری ئازاو سرکە..
گەواڵە هەوری نەوییە..
باراناوە.. گوڵو دڕکە..
کانزای بە نرخو بێ نرخە..
لەو شارانەیش، کە هێشتا هەتاویان تیا نەڕواوە
بەرگی چیا بێجگە لە بەرد
خوێنو دەنگو ئاگرێکی هەڵکراوە..

(*) ئەم شیعرە لە گۆڤاری (کاروان) ژمارە (32)ی ساڵی 1985دا لە ژێر ناوی (نەوزاد بەندی)دا بڵاو کراوەتەوە.





## شیعرە کەمئەندامەکان(*)

( 1 )
لە کادانێکدا
دوو هێلکە قەتێ، بەجێ ماون..
نەشکێن، دوو قەتێ بەڕێوەن..
لە کەنارێکدا
دوو بێچووە کیسەڵ ڕادەکەن..
نەخورێن، دوو عومری درێژ بەڕێوەن..
لە گیرفانی ڕاستمدا
دوو کلیلی قوڕقوشم بەجێ ماون..
نازانم هی کام دەرگان..
پێدەچێ کلیلی دەرگای
سەردەمی زانکۆو..
دەرگای بەشی ناوخۆیی، بن..
یان پێدەچێ کلیلی دەرگای
سەردەمی دڵداریو..
دەرگای کلۆم دراوی یار، بن..
منداڵەکەم، دوو دەنك
بنێشتی دارچینی، دەخاتە ژێر سەرینەکەی
تاکو لەگەڵ کوڕە کەچەڵەی خەونەکانی،
پێکڤە بنێشت بجوون..
لە دیوانەکەی قوباد
دوو شیعر بەجێ دێڵم

(*) ئەم شیعرە لە گۆڤاری (شیعرستان) ژمارە (11)دا بڵاو کراوەتەوە.

بۆ ئەو شەوانەی
مۆولیدەی گەڕەکەکەمان ئەسووتێ..
لە کەلاوەیەکدا، شێتێ
سەری خستۆتە سەر ئەژنۆی
چاوەڕوانی سبەینێ نییە..
کە تۆیشم بەجێهێشت،
لەم دونیایەدا مێیینە نەما..
لەوە دەچوو تۆ دوا ئیمپراتۆری
مێیینە بوویبی و..
بێ کودەتا، تاج و تەختەکەی
لە قەراغ شار فڕێدابێ..
( 2 )
بە دەست خۆم نییە، حەز دەکەم
بە دیار تەرمی شەوەوە، ئێشك بگرم..
وەك ئەوەی حەز بکەم
لە واتای مەتەڵێ تێبگەم..
یان چاوەڕوانی پێکدادانی دوو ئەستێرە..
گەڕانەوەی ئەو کچە چاو هەنگوینییەی
هەموو ڕۆژێ
لە بەردەم کۆلێژی زانستی، چاوەڕوانم بوو..
نیشتنەوەی ئەو کۆترە شینکانەی
حەزیان دەکرد، بزانن من لە ژێر
دارکاژو
یۆکالیپتۆسەکانی موسڵ، چی ئەکەم..
لەوە ئەچێ چاوەڕوانی،





هۆڵی ئەو سینەمایانە بکەم
کە ئالان دیلۆن لە هەڕەتی لاویدا
عیشقی نیشان دەداین..
بلیتی سینەما بە سەد فلس بوو..
من بە پێچەوانەی خەڵکی خوداوە،
لە ڕۆژو.. لە شەوی باراندا
بە بێ چەتر، دەچمە سەر شەقام..
حەز دەکەم بۆنی دونیایەکی
تەڕو..
تەمەنێکی خوساوە بکەم..
پێم سەیرە چۆلەکەکان لە باران دەترسن و..
شیرین
لە ناو ئوتومبێلەکەی باوکیدا،
سەرنجی ئەو کوڕە قۆزانە دەدات،
باران تەڕیان دەکات..
دەستەسرێکی بۆ فڕێدام..
عەتری "وەن مان شۆ"ی لێدابوو..
لێی نووسرابوو:
"پێت ڕازیم.. لاوۆ"
هەژاری شەرمەزاری کردم
باوکم وتی: هەتیو..
ئەو دەم حەبی مەنع هەبووایە
تووشی ئەو دونیا گەوادەم نەدەکردن..
لێم ببوورن..!
( 3 )

ژنێك هەیە،
ناوی درەختە..
لاقی مریشكی بۆ بكڕیت
یان نانی كەڕوو لێداو..
ئەو هەر دەڵێ: خوا شوكر..
كراسی شاژنە دیانای لەبەر بكەیت
یان گوێنی برنجی تەحالوف
ئەو هەر دەڵێ: خوا شوكر..
منداڵەكان
پەلكەكانی دەكەنە جۆلانە..
دزەكان
گرێی فەقیانەكەی دەكەنەوەو
دینارە قەد كراوەكانی، دەدزن..
دارتاشەكان
چاوی تێدەبڕن
پێیان وایە: تاقمێكی نووستنی
لێدروست دەكرێت..
شاعیرێكیش
كە هێشتا فێری شیعر نەبووە
لە سێبەرەكەیدا نوستووە..
پێی وتم:
شاعیر بۆ ئەوە خوڵقاوە
خەمی دنیایێ بخوات..
ئەگەر پێتە
هەر بە چەرخەكەی خۆت





سیگارێكم بۆ داگیرسێنە..
كە دامگیرساند،
ئەو خۆی سووتاند..
"كوپێ قاوەمان پێكەوە هەڵنەدا"
پۆلیسەكان
ناویان لێنام: هێرۆستراتی[1]و
دادگاكانیان لـێ پڕ كردم..
ئازیزەكەم، جوتیارە نەخوێندەوارەكانیش
تەلاقنامەیەكیان بۆ تۆ ناردەوە..
من ئەمزانی
درەخت عومری خەسارە
ئەوەی نەتوانێ رابكات
تاوانبارە..

[1] هێرۆسترات: ئەو پیاوە گریكییە بوو لە پێناوی ناوبانگدا گەورەترین كەنیسەی سووتاند.

## مەزادخانە

سەربانێ، دیوارەکانی ئەفرۆشێ
گوڵێ، پەڕەکانی..
لێڕێ، دارەکانی..
کوندەپەپویەك چاوەکانی ئەفرۆشێ
دڵێ، ترپەکانی
گرێ، کڵپەکانی
ئاوازێ نۆتەکانی ئەفرۆشێ
دەمێ، دانەکانی
خەمێ، ژانەکانی
کچێ مەمکەکانی ئەفرۆشێ
خۆرێ، تیشکەکانی
چاوێ، ئەشکەکانی..
مەخفەرێ پۆلیسەکانی ئەفرۆشێ
شۆڕشێ، کۆبوونەوەکانی..
شارێ، کەڵبەکانی
کەناڵێ، بەرنامەکانی ئەفرۆشێ
قوتابییەك، وانەکانی
مامۆستایەك، پرسیارەکانی..
حیزبێ، شەهیدەکانی ئەفرۆشێ
ریفراندۆمێ، دەنگەکانی..
ئاڵایەك، ڕەنگەکانی..
ڕووبارێ ئاراستەی خۆی ئەفرۆشێ
مانگێ تریفەکانی
عەشقێ ژوانەکانی





نوێژێ رکاتەکانی ئەفرۆشێ
دێڕێ، وشەکانی
وشەیەك پیتەکانی.. ئەفرۆشێ..
ئەوەڵ مەزاد..
کێ ئەیکڕێ؟!

## پــێشبینی

( 1 )

ڕەنگە پانزە ساڵی تر
هەموو ماچەکانم کۆ بکەمەوەو
پێشەکییەکی درێژیان بۆ بنووسمو..
لای شێخ محەمەد سۆڵەیی
ژمارەیەکی سپاردنی بۆ وەربگرمو..
لەسەر ئەرکی خۆم
پەنجا دانەی لــێ چاپ بکەم..

* * *

ڕەنگە سی ساڵی تر
هەموو ددانەکانم کۆ بکەمەوەو
دوو لێوی ئاڵیان بۆ دروست بکەمو
لەلای عەباس ڕاستیان بکەمەوەو
لە بەردەرکی سەرا
بەرامبەر کچێکی چواردە ساڵ
دەمم پان بکەمەوە،
تاکو سیو دوو ددانی ئەرشیفکراوی
نیشان بدەم..

* * *

ڕەنگە سیو دوو ساڵی تر
لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا
دەستەو دامانی دارکاژەکانی
کارێزی وەستا شەریف بم
تاکو هەناسەکانی مناڵیم بداتەوەو
لە دوو توێی چیمەنی ئاودراوی
خانووە شەرقییەکەمانا
بە بیجامەیەکی میلداری پۆپلینەوە





داوای پێنج فلس لە باوکم بکەمو
ئەویش نەمداتێو بڵێ: با مەعاش وەرگرم..
هەناسەکانی مناڵیم زۆربەیان سارد بوون
من هەر لە مناڵییەوە فێری خەمخواردن بووم
مناڵان بە دزی باوانیانەوە
شەکرو ترشو لیمەندۆزییان ئەخوارد..
بەڵام من خەم..

* * *

ڕەنگە پانزە خولەکی تر
ئەم شیعرەیش تەواو بێو..
لە قوژبنێکی خانووە بێ تاپۆکەمانا
فڕێی بەمو..
ببمە هۆی مارەکردنی
ما جاڵجاڵۆکەیەك لە نێرە جاڵجاڵۆکەیەك..
لە نێوان دێڕەکانیدا
تەونەکانیان هەڵبخەنو..
خاڵی گومرگ بۆ ئەو مێشو وشانە دانێن
کە بە بێ پرسی
وەزارەتی تەندروستیو وەزارەتی ڕۆشنبیری
لە تەلبەنی پەنجەرەو
مەرزی شیعرەکانمەوە دزەیان کردووە..

* * *

ڕەنگە سبەینێ تۆ ببینم
بەڵام خۆمت لــێ نەبان ئەکەم
تۆ گاڵتەت بە ئەقڵم بێو
بە ئاماژەیەك تێم بگەیەنیتو.. لێم بپرسیت:
نامەکانت هەموویان ماون
کەڕوو تێی داون..

چی ئەڵێی بە کون فە یەکونێك
(حەیا)ت ببەم..؟





## دواگەڕان

ڕۆژێکیان سەعات یەکی نیوەڕۆ
فەرمانگە بەجێ دێڵمو
ئەمەوێ وەك هەموو ڕۆژێ بڕۆمەوە
کەچی ڕێی ماڵەوە پێنازانم
هەرچەند بیر ئەکەمەوە
هەرچەند نەخشە ئەکێشم
نایدۆزمەوەو.. نایدۆزمەوە..
دەست ئەکەم بە گیرفانماو
مۆبایلەکەم دەردێنم
هەموو ژمارەکانی بێ وەڵامن..
دەست لە تاکسییەك ڕادەگرم:
(کاکی خۆم، بە یارمەتی خۆت
بمبەرەوە بۆ ماڵەوە..
ئەو ماڵەی ئەدرەسەکەی نازانم)
شۆفێرەکە بە زەردەخەنەیەکەوە بەجێم دێڵێ..
ئەچمە بارەگای تەلەفزیۆنێ:
(بەڵکو ئاگادارییەکم بۆ بڵاو بکەنەوە)
ئەڵێن: (بڕۆ بۆ مزگەوت..)
مجێور ئەڵێ: (ساڵێ زیاترە جارِ لە مزگەوت مەمنوع کراوە)
ئەڵێم: (30 ساڵە نوێژ ئەکەم، تەنها جارێ.. ون بووم!!)
مجێور سەر بادەداتو.. بەجێم دێڵێ..
ئەچمە بارەگای ڕۆژنامەیەك:
(ماڵەکەم لــێ ون بووەو..
ئاگادارییەکم ئەوێ..)

سەرنووسەر ئەڵێ: (ئەگەر پێناسەیەكی ئەحوال مەدەنی بوویتایە..
یان مۆڵەتنامەیەكی شۆفێری..
یان 200 دیناری ونبوو، بوویتایە..)
تێدەگەمو.. بەجێی دێڵم..
دوو سەعاتە وەك شێت بە شەقامەكاندا
دێمو ئەچم..
نازانم ئەم نیوەڕۆیە لە كوێ نان بخۆمو..
لە كوێ كەروێشكە خەوێ بكەمو..
لە چ ماڵێ
دەرسو دەوری ئەو ڕۆژە بپرسمەوەو
بە چ ژنێ بڵێم: كچێ ئەمڕۆ لە دائیرە زۆر ماندوو بووم..
دوو سەعاتە وەك سەرخۆش بە شەقامەكاندا لەتر ئەدەم
نازانم بە كێ بڵێم:
كچێ بەس نەبوو خوا ئەم دوو كوونە گورگەی داو..
لە كرێچێتی رزگارمان بوو..
ئەویش بڵێ: ئەرەوەڵڵا.. كرێچێتیو قەرەجێتی..
بە كێ بڵێم: كوڕم مەچۆرە ناو مناڵان
پەیمان بێ كۆمپیوتەرێكی لەنگەت بۆ بكڕم..
بە كێ بڵێم: كچم.. دەنكێ پاراسیتۆڵو قومێ ئاو.. بۆ بابە!
لە چ كتێبخانەیەكدا
مسوەدەی شیعرەكانی دوێنێم دەربێنمەوەو
لە كۆپلەیەك، دێڕێ بكوژێنمەوەو
وشەیەك بۆ دێڕێكی تر زیاد كەم..
لە چ بەردەرگایەكدا
دراوسێ سمێڵ بابڕەكەم ببینمەوەو





پێم بڵێ: (تۆ بڵێی خانووەكانمان لەسەر تاپۆ كەن؟
تاپۆی كەن، ئەرزی تیجارییەو.. لەسەر ئاو
ملیۆنو.. دوو ملیۆن ئەكا..!)
لە چ سەربانێ جووتێ گۆرەوی لە تەنافەكە لێبكەمەوەو
لەگەڵ بینینی ستارەی ماڵە دراوسێكانا
ئاخێ هەڵكێشم بە یادی ئەو ڕۆژانەی
ستارە جێ ژوانی من بوو..
ستارەیەكی بلۆكی ساردو سڕ..
لە چ سەر سووچی كۆڵانێ
باجی ئایشێی هەشتا ساڵە
ڕێم پێبگرێو.. پێم بڵێ:
(ئەزانی! مامۆستا دیسان زێرابەكەمان
گیراوە.. بەڵكو ئەوە خوایە، عەرزوحاڵێكمان
بۆ بدەیتە شارەوانی!)
لە چ بەر دوكانێ،
دوكاندارێكی سوورفل پێم بڵێ:
(تا زووە بیفرۆشە،
سەیارە علوجەكان وەرئەگرنەوە!)
لە چ دانیشتنێكا،
بە هاورێكانم بڵێم:
(كورینە! ئەزانن قوبادی جەلیزادە
شاعیرێكی گەورەیەو..
كەچی هێشتا كەس نایناسێ!)
لە چ ئێوارەیەكدا
لەگەڵ هاورێكانما

لە ماڵێکدا کۆ بینەوەو
بە پلەی ستەیشنی دوو،
یاری فتبۆڵێن بکەین..
تا گەنج بووین بە قاچ
وا پیر بووین بە دەست
بۆ کوێ ئەچی، فتبۆڵ، بە دواتەوەین..
لە چ بەیانییەکدا
بچم بۆ نانەواخانەو..
نانی گەرمو ماست بهێنمەوەو
سۆپاکە داگیرسێنم..
دوو سەعاتە.. دوو سەعات..
شەقام.. شەقام، بێ بەرنامە دێمو ئەچم
پرسیار لە هەموو کەسێ ئەکەمو
کەس ناتوانێ رێی ماڵەوەم نیشان با..

* * *

لەناکاو مەلایکەتێ پەیدا ئەبێو..
بە توورەییەوە پێم ئەڵێ:
هۆو! بەندەی خوا..
تۆ دوو سەعاتە مردووی!



که بووم به خۆڵ

## خۆرو منالّی ئەنفال

ئەمشەو، خۆرم بینی..
گڵۆپەکانی کوژاندبۆوەو..
سیگارێکی ئەمەریکی هەرزانی
بە لێوەوە بوو..
ئەوەی نەیناسیایە
ئەیگووت: پیرەمێردێکی بێکەسەو..
لە خەڵوەتگەی پیری ئەگەڕێ..
گڵۆپەکانی کوژاندبۆوەو..
لە تەنیشت مزگەوتی گەورە، هەڵکورما بوو..
قەزوانی ئەکرد بە تەسبیح..
بنێشتی کوردی ئەکردە نایلۆنەوە..
لە مەیدانی کرێکاران،
دەست بە دەسکێشو ماڵەوە،
چاوەڕوانی وەستایەکی بە ڕەحمی ئەکرد
کاری رۆژێکی بۆ دابین کاو..
رۆژێکی تر عومری درێژ کاتەوە..
گڵۆپەکانی کوژاندبۆوەو..
لە تەنیشت سلێمان پاشادا
تەشتێ گوڵەبەڕۆژەی سوێری دانابوو..
من ئەمناسی، چوومە کنی
پێم گووت: حەیف! کەس ناتناسێ!
ریشی چەناگەی خوراندو
بە دوو چاوی سوورەوە تێی خوڕیم:
(بەسە.. ناماقووڵی مەکە..

لـه سووتان بێزار بووم..
لێمگەڕێ تاوێ لـه كۆڵانه‌كانی شه‌وا
عاره‌قی تەوێڵو بن هه‌نگڵم وشك ببنه‌وه..
لێمگەڕێ تاوێ هه‌ناسه‌ی شه‌وبۆ و
شه‌ماڵی كارێزی وه‌ستا شه‌ریف هه‌ڵمژم..)
كه قسه‌ی ئه‌كرد، فرمێسك لـه چاوی ده‌رئه‌په‌ڕی‌و
تف، لـه نێوان ددانه‌كانی..
كه قسه‌ی ئه‌كرد، بێجگه لـه من، كه‌س حاڵی نه‌بوو
لـه ڕێزمانو.. لـه مانای وشه‌كانی..
گوێم لێبوو، كۆمه‌ڵێ هه‌رزه‌كار ئه‌یانگووت:
(شێتێكی تریشمان زیادی كرد
تڕحێو! شاری هه‌ڵمه‌تو قوربانی)..
ئه‌مشه‌و خۆرم بینی
پێده‌چوو لـه سووكه شه‌ڕێ گه‌ڕابێته‌وه،
ده‌موچاوی جێگای چنگاڵیان پێوه‌بوو..
خوێنی كوونه لووتێكی پژابوو..
شانه‌ی قژی شێوابوو..
ئه‌رزوحاڵێكی به ده‌سته‌وه بوو،
ئه‌یگووت: ئه‌چمه كن وه‌زیری داخیلی
چه‌قۆكێشه‌كانی سه‌ركارێز
لێناگه‌ڕێن بچم بۆ گردی سه‌یوان..
ئه‌یگووت: ئه‌چمه كن وه‌زیری داخیلی
دوو پۆلیس حیمایه‌و..
دوو سه‌د دینار مه‌عاشی پێئه‌بڕمه‌وه..
ئه‌مشه‌و خۆرم بینی





گڵۆپه‌كانی كوژاندبۆوه..
لـه ڕاسته شه‌قامێكا
كه شه‌نگو سه‌رخۆش بوو،
ئه‌ڕشایه‌وه..
سه‌رخۆشه شاره‌زاكان..
سه‌رخۆشه پسپۆره‌كان،
جڕتیان بۆ ئه‌كێشاو..
شووشه‌ی به‌تاڵی بیره‌یان تێئه‌گرت..
گڵۆپه‌كانی كوژاندبۆوه،
لـه پیره‌ژنێكی حه‌فتا ساڵه‌ی ماست فرۆش ئه‌چوو
ده‌لاڵه‌كانی سه‌عه تاكۆیی
ماسته‌كه‌یان لێنه‌كڕیبێ..
لـه كۆلانێكی بێ تاپۆدا،
مامه‌ڵه‌ی لـه‌گه‌ڵ سۆزانییه‌كدا ده‌كردو
ڕێك نه‌ئه‌كه‌وتن..
پۆلیسه‌كانی جینایات یه‌كسه‌ر حازر بوون..
كه‌له‌پچه بۆ ده‌ستو..
سندم بۆ پێ..
ده دوانزه كلاشینكۆف،
هاتنه سه‌ر پێ..
خۆرم دی ئه‌مشه‌و،
قاتێكی لـه‌نگه‌ی لـه‌به‌ردا بوو،
پێده‌چوو نیازی پۆستێكی تازه‌ی هه‌بێ..
ئاگام لێبوو ئه‌یگووت:
هاوڕێكانم ئه‌رزه‌ی چوار سه‌د مه‌تری

مارسیدسی عیفریتیان وەرگرت‌و
منیش هیچ..
ئەیگووت: ئیدی ئەبمە حیزبی
لەوە زیاتر ناتوانم بسووتێم‌و
قەحبەخانەو..
بارو..
مەیدانەکانی جەنگ رووناك کەمەوە..
لەوە زیاتر ناتوانم
گۆڕستان‌و
زیندانەکانی دۆنکیشۆت‌و..
مەرزی قاچاخچییەکان رووناك کەمەوە..
ئیتر خۆم کەنارگیر ئەکەم‌و
لە سایەی حیزبێکا
نێرگیلەی مۆز ئەکێشم‌و..
ڕۆمانی مەدام بۆڤاری ئەخوێنمەوە..
ئیتر خۆم نارەنجێنم‌و..
لە هاوینەهەواری حیزبێکا
سەیری ئەو کچانە ئەکەم،
کە سەیرم ناکەن‌و..
ئەو ماسییانە راو ئەکەم،
کە خواردنی من نین..
ئیتر خۆم پشتگوێ ناخەم‌و
ئەچمە لای دانسازێکی حیزبی‌و
دوا مۆدێل تاقمی دان‌و..
زمان‌و.. ژێی دەنگ بە رادان ئەدەم..





ئەچمە لای سەرتاشێکی حیزبی‌و..
بۆیەو.. تەسریحەو..
بوردەکانی حیزب داوا ئەکەم..
خۆرم دی ئەمشەو
بە دەست دوو پۆلیسەوە
چونکە لە سەرچنار
چاوی لە کچە مەسئولێ داگرتبوو..
* * *
بۆ بەیانی، خۆر هەڵنەهات..
هەویری نانەواخانەکان هەڵهاتن‌و..
خۆر هەڵنەهات..
هەنگامە بەرپابوو..
هەموو کەوتنە سەر چۆك‌و
نوێژیان کردو.. پاڕانەوە..
پیاوە ئایینییەکان..
پیاوە بێ دینەکان..
قاچاخچییەکان..
دزەکان..
پۆلیسەکان..
کرێکارەکان..
قەحبەکان..
سیاسییەکان، خەڵاتێکی چەند هەزار دۆلارییان
بۆ هەر کەسێ تەرخان کرد خۆر ئەدۆزێتەوە..
قەحبەکان خەڵاتێکی چەند هەزار ماچی..
قاچاخچییەکان خەڵاتێکی چەند هەزار فەردە ئاردی..

پیاوه ئایینییه‌كان خه‌لاّتی به‌هه‌شت‌و
پیاوه بێ دینه‌كان خه‌لاّتی گه‌ڕانه‌وه‌و
تۆبه‌كردنیان لـه‌سه‌ر ده‌ستی ئه‌و كه‌سه‌ی خۆر ئه‌دۆزێته‌وه‌، ئیمزا كرد..
دزه‌كان خه‌لاّتی پۆستێكی چوار سه‌د دۆلارییان
بۆ هه‌ر كه‌سێ ته‌رخان كرد، خۆریان بۆ ئه‌دۆزێته‌وه‌..
منالّێكی باوك ئه‌نفالی
دایك ئه‌نفالی.. خوشك ئه‌نفالی.. برا ئه‌نفالی..
مامو خالّ ئه‌نفالی، بۆیاخچی خۆری دۆزییه‌وه‌
چونكه‌ ئه‌ویش به‌ تاوانی بۆیاخچێتی
لـه‌گه‌لّ خۆر زیندان كرابوو..
كه‌چی نه‌ سیاسییه‌كان
چه‌ند هه‌زار دۆلاریان دایه‌و..
نه‌ قه‌حبه‌كان چه‌ند هه‌زار ماچ..
نه‌ قاچاخچییه‌كان چه‌ند هه‌زار فه‌رده‌ ئاردیان دایه‌و..
نه‌ پیاوه‌ ئایینییه‌كان، مژده‌ی به‌هه‌شت..
نه‌ خوانه‌ناسه‌كان تۆبه‌یان لـه‌سه‌ر ده‌ستی ئه‌و كردو..
نه‌ دزه‌كان لـه‌ پۆستی چوار سه‌د دۆلاریدا دایانمه‌زراند..
خۆر گه‌ڕایه‌وه‌ بۆ سووتانو..
منالّه‌كه‌یش گه‌ڕایه‌وه‌ بۆ كۆكردنه‌وه‌ی
گوێچكه‌ نانی
پاشماوه‌ی خوانی
پیاوه‌ به‌رزه‌كانی نیشتمان..





## دوو تابلۆ

( 1 )
هه‌تا ئێستا،
لـه‌ تۆ جوانترم نه‌دیوه‌و..
لـه‌مه‌ودوایش،
نیازم نییه‌
لـه‌ تۆ جوانتر ببینم..
( 2 )
لـه‌ سه‌ندیكای په‌پووله‌
یاداشتێكی نارِه‌زاییم به‌ ده‌ست گه‌یشت‌و..
تیادا هاتبوو:
گوایا من
لـه‌سه‌ر بالّی په‌پووله‌
شیعره‌كانم ئه‌نووسیمه‌وه‌و
دیوانێكی دوو سه‌د بالّیم
لـه‌ ژێر چاپدایه‌..
داوای خوێنی سه‌د په‌پووله‌و..
مانگانه‌و ئه‌رزه‌و جه‌ژنانه‌ی
سه‌د مالّه‌ هه‌تیوو
ماكیاژی سه‌د په‌پووله‌ی بێوه‌ژنیان
لـێكردبووم..
لـه‌ سه‌ندیكای شه‌مشه‌مه‌كوێره‌وه‌
سوپاسنامه‌یه‌كم به‌ ده‌ست گه‌یشت
گوایا من، مالّه‌كه‌م هێمنه‌و..
نه‌ به‌ شه‌و سه‌مای پالّێیان

لــێ تێك ئەدەمو..
نە بە رۆژ خەویان ئەزڕێنم..
لـە سوپاسنامەکەدا نووسرابوو:
تکایە شەوی هەینی
کاتژمێر دەو نیو
بفەرموو بۆ بارەگاکەمان
بۆ وەرگرتنی خەڵاتی
شەمشەمەکوێرەی ئاڵتوونی..
منیش دوو روونکردنەوەم
دا بە رۆژنامەی هاووڵاتی،
روونکردنەوەی یەکەم:
من تا ئێستا شیعرەکانم
لـەسەر دەفتەری بیستو هەشت لاپەڕەیی
یونیسێف ئەنووسمەوە
لـەبەر ئەوەی هەم سفتو بێ گرێنو..
هەم جووتێکی بە دینارێکە..
شیعر کەی لـەسەر باڵی پەپوولـە ئەنووسرێ؟
باڵی ئەوان وەك تابلۆی ئیسماعیل خەیات
جێگەی هیچی تریان، تیا نەماوە..
باڵیان ئەڵێی بەروانکەی
منالێکی دوو سالانە، یاری بە شاتوو کردبێ..
شیعر کەی لـەسەر باڵی پەپوولـە ئەنووسری؟..
روونکردنەوەی دووەم:
من لـە دونیای خودادا
رقم لـە شەمشەمەکوێرەیەو





کاتێ بیر لـەوە ئەکەمەوە
کە هەردووکمان لـە پۆلی شیردەرەکانین
قێز لـە مرۆڤ ئەکەمەوەو
حەزم ئەکرد گوێچکە ماسییەکی
مێزەر سپی
دەستو داوێن پاکی
بنی دەریایێ بوومایە..
هەر بۆیە ئەو سوپاسنامەیە
رەت ئەکەمەوەو
خەڵاتەکەیشتان وەرناگرم..

* * *

هەتا ئێستا
نە (هاووڵاتی) روونکردنەوەکانی بۆ
چاپ کردووەو
نە خوێنی سەد پەپوولـەو
مانگانەو.. ئەرزەو.. جەژنانەی
سەد ماڵە هەتیو..
ماکیاژی سەد پەپوولـەی بێوەژنم داوە..
نە خەڵاتی شەمشەمەکوێرەی
ئاڵتوونیم وەرگرتووە..

## ئەو ساتانەی لە یادم ناچن(*)

وێنەی شارێکم کێشا
لە ژێر باڵی تەما بوو
وێنەی پێکێکم کێشا
دڵۆپەی تیا نەمابوو
* * *

کاتێ خۆر کوژایەوە
هەڵبەستێکم کرد بە مۆم
ڕۆژی دوایی پێمزانی
گڕم بەرداوەتە خۆم
* * *

کاتێ بۆ تاهەتایە
دڵدارەکەم کۆچی کرد
لەسەر گۆڕەکەی وەستام
نەمئەزانی بۆچی مرد؟
* * *

ڕۆژێکیان زۆر برسی بووم
برسێتی لێم بوو بە ژان
سەیر ئەکەم شیعرەکانم
یەك بە یەك ئەبن بە نان..
* * *

شەوێکیان زۆر تەنیا بووم
بوو بە ڕەهێڵەو زریان..
لەناکاو دڵم پڕ بوو
دەستم پێکرد بە گریان

(*) ئەم شیعرە لە ڕۆژنامەی (هاوکاری) ڕۆژی 1990/7/9 بڵاو کراوەتەوە.





* * *

هەر خۆم لەسەر شەقام بووم
ئاگرێکم چاو لێبوو
نەورۆزم کەوتەوە یاد
مۆمی بەختیاریم پێبوو
* * *

ڕۆژێکیان لەسەر دیجلە
شکم نە ئەبرد کەسێ
لەتاو دەردی بێکەسی
بووم بە هاوڕێی نەورەسێ
* * *

شەوێ لەسەر شەقامێ
نوستم هەتا بەیانی
زەویم کرد بە پێخەفو
ئاسمانیش بە بەتانی
* * *

منداڵان کە دەرئەچوون
باوکیان دیاریی بۆ ئەکڕین
منیش لەجیاتی دیاری
شەقو تفو تێخوڕین..
* * *

کاتێ کە مێرمناڵ بووم
زۆر بێزار بووم لە ژیانم
هەوڵم دا خۆم بکوژم
بەڵام دەرنەچوو گیانم..
* * *

رۆژێ بە خەیاڵەوە
بەردێکم گرتە دارێ
کۆمەڵێ باڵدار فڕین
یەکێکیان کەوتە خوارێ..

* * *

ئەبوو لێك جیا بینەوە
بۆیە پێم وت: ماڵئاوا
وەڵامی نەدامەوە
گریا هەروەکو ساوا..

* * *

ئیتر زانکۆم بەجێهێشت
بەیانییەکی زۆر زوو
تەنانەت مەلی شیعریش
لە ناخمدا نوستبوو

* * *

کازیوەیەکی زستان
سڕی کردبووم سەرما
ئاگرێکی مەزنیش
داگیرسابوو لە سەرما..

* * *

وێنەی دوو گەڵام کێشا
لێم نووسی بە من نامۆن
پرسی: مەبەستت چییە؟
وتم: چاوەکانی تۆن..

* * *

سەیرم کرد، سەیرم ئەکاو
هەڵبزڕکاوە ڕەنگی





کە ویستم بیدوێنم
جێیهێشتم بە بێدەنگی

* * *

ئەمانە هەندێ تابلۆی
پێشانگەی ژینی منن
گەلــێ تابلۆی تریش هەن
لـە ناخی دڵما ونن..

## خانەی هونەرمەندان

لافاو بوو بە پەیکەرتاشێکی
ریش سپیو..
پەیکەری شیوێکی قووڵی
لـە بەردەرگاکەمان تاشی..
خۆر بووە وێنەکێشێکی
بێزار لـە ژیان،
تابلۆی ئاگرێکی گەورەی
لـە دارستانەکان، کێشا..
ئەمشەو خەفەت
لێم بوو بە مایکل ئەنجیلۆو
پرتەقاڵی فرمێسکێکی
لـەسەر رووومەتی من پاك کرد..
شیعر لێم بوو بە دافنشیو
مۆرەی (یار)ی
لێکردم بە زەردەخەنە..
بەهار بوو بە شێوەکارێکی رۆمانسیو
هەرچی رەنگێ شکی ئەبرد
لـەو دەشتو دەرە، هەڵیڕشت..
شەو وەك سلڤادرۆ دالی
رەنگەکانی رەش کردەوەو
لـە گەرەکێکی تاریکا
مشکە رەشەکانی کێشا..
باران بوو بە وێنەکێشێکی دوای جەنگو
سکێچی نانێکی گەرمی





بە پەنجەرەوە هەڵواسی..
دڵـم خۆش بوو،
سوپاسم کرد
کە پەنجەرەکەم کردەوە،
خاك خەریك بوو
تابلۆی مەزرای ئەنەخشانو
چۆلـەکەکان
وێنەی هێلانەیان دێناو
لـەسەر لقو پۆپو دیوار
ئەیانکردە پەیکەری پووش..
کۆمەڵێ منالی مەکتەب
بوون بە عەلی مەندەلاویو
شاریان پڕ کرد لـە مریشکی رەنگاورەنگو
پیاوی لووت زل..
لـە قەلی دەنووك چەخماخیو..
پیاوی سوورفل..
تۆیش وەك پەیکەرتاشێکی گەرۆك
وەك پەیکەرتاشێکی نەرجسی
بیابانی دەروونمت پڕ کرد لـە پەیکەری خۆتو
بەجێیشت هێشت
دەروونم بوو بە بتخانە
ئیبراهیمێ لـە کوێ بێنم
سەر لـە بەریان بێنێتە خوار؟
نەوت بوو بە پاپلۆ پیکاسۆو
لـە وڵاتەکەماندا

رستێ تابلۆی جەنگی کێشا
بە خۆڕایی بەسەرمانا دابەشیان کرد..
بە خۆڕایی بە دیوارە رووخاوەکانمانا، هەڵیانواسی..
هەژاری بوو بە سیزانو
ماڵی دەوڵەمەندەکانی پڕ کرد
لە پەیکەری کچی رووتو..
دەستی سیاسییەکانی پڕ کرد
لە تۆپی مەمکی بریندار..
چەن بێ ویژدانە هەژاری،
ئەو هەموو پەیکەری مەڕەی
لە بەردەم گورگەلا کێشا..
چەن بێ ئیمانە هەژاری،
ئەو هەموو پاکیزەییەی
لەسەر جادەکان فڕێ دا..
ئەو هەموو داستانی عەشقەی
وەك شووشەیەکی بێ بەها
کێشا بە دیوارەکانا..
کوللە بوو بە میللیەو
گسکی لە مەزراکانمان داو
ژنەکانمانی فێری گوڵەوەچنی کرد..
منالەکانمانی فێری بۆیاخکردنی پێڵاو کرد..
شاعیرەکانمانی شێت کرد.. وای لێکردن
لە بەردەرگای حیزبەکانا راوەستنو..
داوای یارمەتیو.. جەژنانەو..
رێزلێنانو.. شتی تر بکەن..





دیکتاتۆر بوو بە وێنەکێشێکی گرافیكو
وڵاتەکەی کرد بە خەڵووز..
شەوی کردە بەری دایکانو
رەنگی زەردی خستە سەر پێستی
منالانو..
کردنی بە هێمای هەتیو
دەشتو دەری پڕ کرد
لە پەیکەری تەرمو..
پەیکەری تانکی سووتاوو..
ئاسمانی پڕ کرد
لە پەیکەری رەشی دوکەڵ..
دیکتاتۆر لە چڵەپۆپەی رۆمانسیەتا
تابلۆی کۆمەڵێ سواڵکەری
لە بەردەم مزگەوتەکان، کێشا..
پەیکەری کۆمەڵێ سێدارەی
لە ناوەڕاستی شار تاشی..
پەیکەری کۆمەڵێ سەربازی راکردووی
بە بێ گوێچکە دروست کرد..
پەیکەری کۆمەڵێ ئافرەتی شۆڕشگێڕی
بە بێ پەردەی بوکێنی، دروست کردا..
لە نوقولێ، پەیکەری فیشەکێكو..
لە ماچێ، تابلۆی تفێکی نەخشان..
بە دوو فلچە، سەیرانگایەکی کرد بە سەربازگە
بە دوو چەکوش، کاریکۆتێکی کرد بە سەنگەر..
بە نووکە قەڵەمێ، یەك ملیۆن خوێندکاری زانکۆی

کرد بە سەرباز..
بە دوو راستەهێڵ، سفرەی کرد بە قەسعە..
شاری کرد بە ئۆردوگا..
کۆشکی کرد بە خێمە..
جامانەی کرد بە کاسکێت..
خەوی کرد بە خەیاڵ..
بە فڵچەیەك ملیۆنەها کەسی ئاوارە کرد..
وێنەکێشێکی چالاکە.. زۆر چالاکە دیکتاتۆر..
هەر قەڵەمی خستە سەر کاغەز،
هەزارەها ژن ئەکاتە بێوەژنو..
هەرچی مەزرا هەیە،
ئەیکاتە سەحراو..
هەرچی دارستان هەیە،
ئەیکاتە گۆڕستان..
بەڵام بە داخەوە! تەنها رەنگی رەش بەکار دێنێ..
مەگەر لە حاڵەتی برسێتیو..
هەتیوکەوتنو..
ئەسکارسا، زەرد بەکار بێنێ..
ئەگینا تەنها رەش بەکار دێنێ..
وێنەکێشێکی چالاکە.. زۆر چالاکە دیکتاتۆر..
هەر دەستی دایە فڵچە
ناسکترین شیعری دڵداری
دەکاتە سروودی تایبەتی بۆ خۆی..
هەر دەستی دایە فڵچە
هەموو سوچو گوێسەبانەکان





دەکاتە شوێنی تایبەتی بۆ وێنەی خۆی..
لاوان فێر دەکا لەجیاتی قۆڵ بکەنە قۆڵی
خۆشەویستەکانیان، بیکەنە قۆڵی کلاشینکۆف..
قەڵەم فێر دەکا، لاپەڕە بدڕێنێو..
لەجیاتی نووسین، هەوڵی تەقین بدا..
خۆشنووسەکان فێر ئەکا تەنها لە خامی رەش
هەواڵی مەرگ بنووسن..
شەکر فێر ئەکا بسووتێو..
رەنگی رەشو تامی تاڵ، پێشکەشی دونیا بکا..
چەن سەگو سەگبابە! دیکتاتۆر..
حەق وایە لە خانەی هونەرمەندان دەریکەینو..
ئابوونەکەی بدەینەوەو..
ناسنامەکەی لێسێنینەوە..
حەق وایە رەنگی رەشی پێنەفرۆشینو..
تابلۆکانی لێنەکڕینو..
گەلەرییەکەی بتەقێنینەوە..

* * *

مناڵ لە ڤان کوخ ناسکتر وێنە ئەکێشێ
بە فڵچەی مناڵ، تاجی پاشا هێندەی زەنگیانەیەکەو..
میزڵدانو گوڵەمێخەك لە رۆکێت گەورەترن..
مناڵ رەنگی رەش بەکار ناهێنێ..
مناڵ بۆنی هونەرمەندێکی
ناو رەیحانەی لێدێ..
رەنگەکانی بۆنی نوقوڵی ترشو شیرینیان لێدێو
ئاسمانەکانی، پڕن لە گوڵ ئەستێرە..

منالّێ بکەنە سەرۆکی دەولّەت..
ئەو پیرەمێردانە بهێننە خوارێ..
منالّێ بەرز بکەنەوە،
با ئەو ئالاّمان بۆ رەنگ بکا..
پێویستمان بە سیاسەتی منالّییە..

* * *

سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان، وێنەکێشان نازانێ
ئەیەوێ وێنەی تەرازوویەك بکێشێ،
کەچی لاسەنگ ئەبێ‌و..
ئەیەوێ کۆمەڵێ تاوانبار ببا بۆ زیندان،
کەچی لێی تێك ئەچێ‌و
ئەیانبا بۆ سەیران..
ئەیەوێ شۆڕشگێڕێ ئازاد کا،
کەچی لێی تێك ئەچێ‌و
ئیمزای حوکمی تاهەتایی بۆ ئەکا
ئەیەوێ کۆمەڵێ ساروخ ئاراستەی
فڕۆکە پەڵە پەڵەکان بکا،
لێی تێك ئەچێ‌و
کۆمەڵێ گوڵی نێرگزو شەهلایان تێئەگرێ..
چاویشی کزەو..
لە بەردەمیدا هەزاران کچ ئیغتیساب کرانو
ئەو هەر نەیبینی..
هەزاران منالّ کرانە کەبابو
ئەو هەر نەیبینی..
هەزاران وشە دەرکران لە ئیعرابو





ئەو هەر نەیبینی..
ئەیەوێ هێلانەیەك بۆ کۆترە ئاوارەکان
دروست کا.. کەچی
هێلانەکە ئەبێ بە قەفەسی راوچێکان..
ئەیەوێ گوڵ فڕێ داتە سەر
گۆڕی سەربازی ون،
لێی تێك ئەچێ، نارنجۆکی بۆ فڕێ ئەدا..
چەن بێئاگایە لە وێنەکێشان..
حەق وایە دارا حەمە سەعی
خولێکی پەیکەرتاشی‌و شێوەکاری بۆ بکاتەوە..
ئەترسم لێی تێك بچێ
لەجیاتی بچێ بۆ لای دارا حەمە سەعی
بچێ بۆ لای عەلاو بەشیر..

## سیرو پیاز

تێنەگەیشتین لـە یەکتری
نە تۆ لـە نامەی درێژو
نە من لـە وشەی: بیرت ئەکەم..
نە من لـە سەرنجی قووڵو
نە تۆ لـە موعاناتو خەم..
وامئەزانی تا تۆختر بۆت بنووسم:
(خۆشم ئەوێی)
باشترو باشتر تێم ئەگەی
وامئەزانی هەتا دووبارەی کەمەوە:
(خۆشم ئەوێی)
زووترو زووتر پێم ئەگەی
واتئەزانی وەکو کورسییەکی لارێ
تاوێ لام بحەسێیتەوەو ئیتر بڕۆی،
زوو لـە یادم ئەچیتەوە..
واتئەزانی وەکو کوپێ قاوەی ناوەخت
بمخۆیتەوەو..
لـە بەر بەلوعەی دەستشۆرێ
بمشۆیتەوە، ئیتر تامی لێوەکانتم لـە یاد ئەچێ..
واتئەزانی وەك رۆژنامەی ریسێپشنی عیادەیەك
چاوێکم پێدا بخشێنیو
بە مووکێشی دیدەکانت هەندێ وشەم لێدەربێنی
ئیتر رەنگی چاوەکانتم لـە یاد ئەچێ..
تێنەگەیشتین لـە یەکتری..
نە تۆ لـە ئازاری شیعرو





نە من لـە داوی کچی جوان..
نە تۆ لـە تامی دڵداریو
نە من لـە پەیوەندیو عەشقی
ئاخر زەمان..
من هەموو دڵو دەروونم
بۆ خستیتە سەر کاغەزو
دامە دەستت..
تۆ یەك وشە نەبوو بە ئاو
لـە سەهۆڵبەندانو شەختەی
بیرو هەستت..
نەمئەزانی عەشقی ئەمڕۆ
وشە ناکا بە تانو پۆ..
نە سەردەمی نامە ماوەو
نە شیعر ئەتوانێ بەردو
دارو
ئاسن، بێنێتە گۆ..
تۆ چووزانی خۆشەویستی
لاپەڕەیەکی چەن سپیو
تیشکهاوێژە..
من چووزانم عەشقی ئەمڕۆ
وەکو مارێ بە نهێنی
بە بێ ورتە
بە بێ خشپە..
لـە سوچێکا،
هەرچیت پێیە هەڵیرێژە..

من چووزانم مۆدێلی شیعر مردووەو
خۆشەویستی وەکو ئوتومبێلی لـەنگەی لێهاتووە،
زۆربەی زۆریان لـێدراون..
زۆربەی زۆریان چەندین جار بۆیاخ کراون..
زۆربەی زۆریان داگیراون..
هەڵـگیراون..
هەزار جار لـە بەردەم فیتەر راگیراون..
تێنەگەیشتین لـە یەکتری..
تۆ بە بارێ شیعری منەوە، نازانی
بۆ کوێ بڕۆی.. نازانی بیخوێنیتەوە
یان بیانخۆی..
من بە بارێ قەهری تۆوە، نازانم
چۆن هێندە لـێت دوور بکەومەوە،
بیشتبینم، نەزانم تۆی..





## مێرووی نەخۆش

هیچ توانایەکم نەماوە
ئەگەر جاران کەسێ دڵی بشکاندمایە
ئەو دەڤەرەم جێدەهێشتو
ئەو کەسە لـە من حەرام بوو..
کەچی ئەمڕۆ
دوای ئەوەی تۆ
دڵمت کرد بە مەیدانی جەنگ،
هێشتا جار جار بۆت ئەڕوانم
وەك ئەو تەیرە خورماخۆرەی
شێتێ کڕیویێتیو..
نازانێ چۆن تێیگەیێنێ
تەیری قەفەس
وەکو پیاوی ناو ئۆردوگا
پێویستی بە دانو ئاوە..
هێشتا جار جار ئیمەیلێکت بۆ ئەنێرم
یان مەسیجێ..
ئەڵێم: نەخێر.. بیری ماوە..
بەڵام..
کە چرکەو سەعات ئەڕۆنو..
کۆمپیوتەرو
مۆبایلـەکەیشم بێ وەڵام..
ئەڵێم: نا.. بیری نەماوە..
بڕیار ئەدەم دوور کەومەوە..
بڕۆم بۆ کوێ؟

مردوو، گۆڕیش بەجێ بێڵێ
هەر مردووە..
کە پەڕەکانی گوڵ هەڵوەرین،
بەهاریش ساڵ بەجێ بێڵێ
هەر مردووە..
کە تەمەن ڕۆی،
چرکەیش سەعات بەجێ بێڵێ،
پیری، ژەهری خۆی ڕشتووە..
کە تۆم خۆش ویست،
خوێنی سەددامیشم تێکەن،
تازە هەر تۆم خۆش ویستووە..
بڕۆم بۆ کوێ؟
وا هەست ئەکەم جێیەك نەبێ
تۆی لێنەبی..
ئیتر بۆ ڕاکردن لە تۆ
ڕوو بکەمە کوێ؟..
کام کەژو کۆ..
ئەڵێم: نەخێر.. ئەمێنمەوە
بەڵام چیدی
شیعر بۆ ئەو ناخوێنمەوە..
چیدی لە بۆنەو جەژنانا
بۆی نانێرم کارتی گوڵ — گوڵ..
با لای وا نەبێ عەشقی ئەو ئەبەمە گڵ..
نالی، شارەزوویشی بەجێهێشت
نە حەبیبە پەشیماننامەی بۆ ناردو..





نە عەشقێکی تازەیشی لەوێ دۆزیوە..
ئەڵێم: خۆر، ئاسمانیش بەجێ بێڵێ
مانگ واز ناهێنێ لە لەنجەو
سەیرانو نازی شەوانی..
ئیتر وەك مێروویەکی نەخۆش
هەر ئەخولێمەوە لەو ناوە..
خێرخوایەك شك نابەم بڵێ:
کە تۆ هیچ توانات نەماوە
بۆچی بە بێ دەنگی عومرت
نادەیت بە دەم ڕەشەباوە؟..

## پەیڕەوی ناوخۆم

( 1 )

ئەمەوێ لە بێ دەنگی درەختێکدا
خۆم حەشار دەم
پاییز گەڵاکانی رزاندووەو
ئەو هەر بێ دەنگ..
ئەمەوێ لە بێ رەنگی شاعیرێکا
خۆم مەڵاس دەم
بۆیاخچێکان تەنگیان پێهەڵچنیوەو
ئەو هەر بێ رەنگ..
ئەو کانییەی بە پێی پەتی
بە بێ چرپە
بە ناو چیمەنا رێ ئەکا
کێ ئەیناسێ؟
کەس نایناسێو..
کەس ناناسێو..
من ئەیناسم..
ئەو نامناسێو..
وەکو خورپە
ختوکەی پەنجەی پێم ئەداو
بە بێ چرپە
بە ناو تەمەنا رێ ئەکا
من تەمەنم لە کۆستەرێکا لەبیر چوو
کە چوومە بەردەم ئاوێنە
داوی جاڵجاڵۆکەی پیری





هەموو رووخسارمی تەنی بوو..
من تەمەنم لە لای کەرێکا لەبیر چوو
ناوم لێنابوو شا جوانو
هەزار نامەو..
شیعرم خستە کورتانەکەی..
تێنەگەیشتو..
لێم زویر بوو..
رزگارم بوو لە زەڕینو
لە جووتە بێ ئامانەکەی
من عاشق بووم
بەڵام لە مەیدانی جەنگا
یان لای حەیوانفرۆشەکان
لە زیندانی ئینفرادی
یان لە هۆڵی قەحپەخانە..
بە کاری چی دێ ئەم عەشقە؟
من عومری خۆم لە ژێرابێکا بەسەر برد
پێم وابوو ئەمە خەباتە..
بۆ داهاتوو، ئەمە مەشقە..

## پەیڕەوی ناوخۆم

( 2 )

ئەم بەهارە
ئەچمە داخوازی درەختێو
لەگەڵ خاك رەگ تێکەڵ ئەکەم..
لەگەڵ رووبارا هەناسەو
لەگەڵ هەوا گەڵاکانم..
لەوە زیاتر حەزم لە گەڕانەو
بەرەڵڵایی و
کۆڕەو نییە..
سێبەر ئەدەمە دەست خۆرو
گەڵاکانم بە بێ تەقە
تەسلیمی پاییز ئەکەمەو
بە رووتو قووتی لەگەڵ شەختە
هەڵئەپەڕمەو
بێ ئۆقرە چاوەڕێی ئەو وێنەکێشە کلاسیکییە..
ئەو وێنەکێشە فۆتۆگرافییە، ئەکەمەو..
لەوە زیاتر حەز لە هەڵبژاردنەو
کورتەی هەواڵو..
کودەتاو..
گفتوگۆ ناکەم..
لەوێ لەگەڵ پنچکە گیایەك
چاوەڕێی شەختە ئەکەینەو..
بە رووبارێك ئەڵێین: (خواحافیز..
سڵاومان بگەیەنە بە دەریا)..
لەوێ لەگەڵ پاسارییەك





هێلانەیەك لە پووش ئەچنینەو
بە پەرەسێلکەیەك ئەڵێین: (خواحافیز..
سڵاومان بگەیەنە بە سەحرا)..
لەوێ، لەگەڵ خاڵخاڵۆکەیەك
مەسافەیەك لە بێدەنگی ئەکێشینەو..
بە شاعیرێ ئەڵێین: (خواحافیز..
کە چوویتە هەندەران
رەنگی دارکاژەکانی مامەیارەت لە یاد نەچێ)..
لەوێ لەگەڵ شەماڵێکا..
قژی گیایەك رێك دەخەینەو..
بە رەشەبایەك ئەڵێین: (خواحافیز..
چینکۆی بنمیچی ماڵە هەژارێ هەڵمەگرەو..
رێی قوتابخانە،
لە قوتابییەکی پۆلی یەك، مەشێوێنە)..
لەوێ لەگەڵ گۆڕێکدا،
جێگەی خەوتن بۆ پیرەمێردێ چاك دەکەینەو
بە دار ئەرخەوانێ ئەڵێین: (خواحافیز..
ئەوەندە روو مەدە بە پاسارییەکان
با مەرگمان تۆزێ هێمن بێ!)..

* * *

ئەم بەهارە
کە بووم بە درەخت..
بە تەمەن ئەڵێم: (خواحافیز..
تۆ هەر تەشی خۆت بڕێسەو
منیش لەسەر یەك قاچ
تا دونیا ئاخر ئەبێ
رائەوەستم)..

## یەكو یەك، دوو ناكا

نیوەڕۆیەكی هاوین
كە كارەبا ئەبڕێ
كە قرچەی گەرما دێو
كە رووی ژیان چرچو لۆچ ئەبێ..
روویداوە مێشێ
بە پشتی دەستمەوە نووساوە..
بە قاچی چەپی، باڵی چەپی سڕیوەو..
نیمچە كڕنووشێكی بۆ من بردووە،
ئەپرسم: ئای! ئەی مێش..
رەنگە من پێش تۆ بمرم..
كە تۆ ئەمری،
بە بێدەنگی لـە قوڕنەیەكدا
رائەكشێی..
كۆمەڵێ مێروولـە، وەك پیاوی كەنیسە
دێنو.. پارچە پارچەت ئەكەن..
بەڵام من، بە دونیایەك گریانەوە
ئەمبەن بۆ گۆڕستانو..
دونیایەك بۆگەن بڵاو ئەكەمەوە..
* * *
ئێوارەیەكی هاوین
كە دەنگی قاژەی
قەلێك
لـە ئاسۆی پرتەقاڵییەوە،
تێكەڵ بە عارەقی ئەو كرێكارانە ئەبێ،





كە دوای رۆژێكی وەك چیمەنتۆ،
ئەیانەوێ بە شەونم، غوسڵ دەربكەن..
مانگ بە شەرمەوە
لـە نێوان تارای خۆڵاوی ئاسمان
خۆی نیشانی گومەزی مزگەوتو
حەمام ئەدا..
ئەپرسم: ئای! ئەی مانگ
رەنگە من پێش تۆ بكوژێمەوە..
كە تۆ تاریك ئەبی
منداڵەكان خەو ئەیانباتەوەو
پیاوەكانیش دەنگی تەنەكە
ئەنێرن بە دواتا..
بەڵام من ئەمبەنە لای پزیشكو
دوعام بۆ ئەكەنو..
دواجار بە بیست دینار
لافیتەیەكی تاریكم بۆ ئەنووسن،
تۆ دەردەكەویتەوەو..
منیش.. ئەمرم..
* * *
من پەیوەندیی نهێنیم
لـەگەڵ زیندانا هەیە..
لـە بەرچاوی خەڵكی ئازادمو
لـە بەرچاوی خۆم
لـە ژوورێكی نسرمی ئەبو غرێبمو
ساڵـەهایە

کەسێ سەفەرتاسێ خواردنم
بە دیاری بۆ ناهێنێ





## من و تۆ

من و تۆ قەت نابینە هاوڕێ
من و تۆ قەت نابینە دوژمن..
بە سەرکەوتنی یەکتری دڵتەنگین
بە رووخانی یەکتری دڵتەنگین..
کە ئەتبینم، حەز ئەکەم نەتبینم و
کە ناتبینم، بیرت ئەکەم..
کە ئەمبینی، حەز ئەکەی نەمبینی و
کە نامبینی، بیرم ئەکەی..
تەلەفۆنەکە هەڵئەگرم و..
ژمارەکەت ئەنووسم و..
یەکسەر ئەیکوژێنمەوە..
دیارییەکت بۆ کڕیوم
ئەمدەیتێ و.. پەشیمانیت..
وەری ئەگرم و.. پەشیمانم..
ئەمەوێ بیگەڕێنمەوە..
بیگەڕێنمەوە پەشیمانم..
نەیگەڕێنمەوە پەشیمانم..
نیو سەعات قسەمان کرد
هیچ لە یەکتری تێنەگەیشتین
قسەم پێئەبڕیت..
قسەت پێئەپڕیم..
جنێومان بە یەکتر داو..
فرمێسکمان بۆ یەکتر ڕشتو..
پەشیمان بووین..
بەقەدەر شیعرێك خۆشم ئەوێی

که ئەینووسمو.. لێم ون ئەبێ..
که چاپ ئەبێو.. کەس نایخوێنێتەوه..
بەقەدەر وتارێك رقم لێته
که ئەینووسمو.. دەستەی نووسەرانێ زویر ئەکا
ئیتر ئەگەر ئەلیادەیش بنووسم،
بۆم چاپ ناکەن..
که دێی بۆ لام
کام جلە ناشیرینە لەبەری ئەکەی
رائەوەستیت، وەك ئەوەی لە بەردەم
تاسەیەکی پلاستیکی شەقاما راوەستابیت..
رائەوەستیت وەك ئەوەی لە بەردەم
پۆلیسێکی مرورا راوەستابیت..
هەوڵ ئەدەی سەیرم نەکەی
هەوڵ ئەدەم سەیرت نەکەم..
ئەمەوێ قسە بکەمو.. گوێت لێنەبێ..
ئەتەوێ هاوار بکەیتو.. گوێم لێنەبێ..
ئەتەوێ بیسەلمێنی که ناشیرینیو
شایانی ئەو هەموو بێدارییە نیت..
ئەمەوێ بیسەلمێنم که سۆزانیتو
شایانی ئەو هەموو دڵدارییە نیت..
لە یەکتری تێناگەینو..
بە بێدەنگی یەکتر بەجێدێڵین..
هەنگاوەکانم بۆ پێشەوە پەشیمانن..
بۆ دواوە پەشیمانن..
بۆ چەپ پەشیمانن..
بۆ راست پەشیمانن..
منو تۆ قەت نابینە هاورێ..





منو تۆ قەت نابینە دوژمن..

## پێشبینی

( 2 )

ڕەنگە بیست ساڵی تر
هەنگاوەکانم کۆ کەمەوەو
پیایانا بچمەوەو
ڕێکیان خەمەوەو
یەکیان خەمەوەو
بە یارمەتی کارمەندێکی سیاسی
لە بەردەرکی سەرا
لە خوار وێنەکەی شێخ مەحمو
سێپێییەکیان لێدروست کەم..

* * *

ڕەنگە پێش مردن، بە مانگێ..
هەموو تەمەنی تۆزاویم
بتەکێنم..
بە (موعجیزە) هەتاکو بریقو باق، بیشۆم..
نینۆکەکانی بقرتێنم..
سمێڵو ریشی بتاشم..
ماکیاژێکی بۆ بکەمو
بیخەمە بەردەم شەستەی بۆن..
جا پێشکەشی منالآنی کەم
وەك زنجیرەی ئەفلام کارتۆن..

* * *

ڕەنگە ڕۆژێ بە سەرما بێ
بە مقەستەوە بکەومە شار..





سمێڵی گەورەپیاوەکانی بقرتێنم..
جووتێ گۆرەوی لــێ بچنم..
بیکەمە پێی ڕەق هەڵهاتووی
منالێکی بۆیاخچی کن سینەماکان..
لەوە زیاتر پێویستمان نییە پیاوماقووڵ..
کە مەلەوانی تیا نەبێ،
بەکاری چی دێ گۆمی قووڵ؟..

## ئیتر چیدی

كێ مۆڵەتی لێخوڕینی دەوڵەتی
دا بە سیاسی؟
كێ مۆڵەتی لێخوڕینی شاعیری
دا بە وەزیری ڕۆشنبیری؟
بە دەست من بووایە،
مرۆڤم كەمتر دەخستە بازاڕەوە،
نرخەكەی تووشی هەڵئاوسان بووە..
بە دەست من بووایە،
نەمدەهێشت چیدی وەرزەكان
دەستی یەكتر بگرنو
بخولێنەوە..
تا لەگەڵ نێرگز تەعارف ئەكەم
شارای هاوین تەوێڵم ئەسوتێنێ
تا لەگەڵ پشكۆكانی ئابدا دانووستان ئەكەم
باڕێزەی پاییز هەناسەم سوار ئەكا..
تا گەڵاڕێزان ڕازی ئەكەم بیكەم بە وشە،
زستان وەك پیرەمێردێكی بێ وێڵو ئوسوڵ،
ڕێگەی فەرمانگەم ئەكا بە هەڵدێر
ئەپچڕێتەوە پەیوەندی سلێمانیو هەولێر..
تا لەگەڵ پەنجە تەزیوەكانی كانوونا ڕادێم،
گوڵاڵە سوورە چاوی ئەڕێژێو..
ڕدێنی كانوون ئەبێ بە كانیاو..
سەربانی غوربەت بە من ناڕوخێ..
كچی تەنیایی سیحری لێكردووەم..





كێ مۆڵەتی لێخوڕینی فرمێسكی
دا بە ئازار؟..
كێ مۆڵەتی لێخوڕینی ئازاری
دا بە برین؟..
كێ مۆڵەتی لێخوڕینی گریانی
دا بە هاوار؟..
من بە تەنیا،
بووم بە سێبەری دڕكەزی..
ئیتر چیدی لەگەڵ نێرگزا ژوان ناگرم
بەسەر پشكۆدا ڕێ ناكەم
شیعر بۆ باڕێزە ناڵێم
داڵدەی ڕنوە بەفر نادەم..
ئیتر چیدی..

## کوژانەوەی مۆمەکان

رەنگە شانەی عومر هێشتا
پەلـێ هەنگوینو
کۆمەڵێ
هەنگی ماتی پێوە مابێ
تۆ بووکەشووشەی منالّی
یان بالّۆنە سوورەکانی
لـە نێوان دەستو تەقینا
هاتنەوە یەك‌و بنمیچی
ژوورەکەتیان بەجێهێلاّ
هەڵیانبگرەوەو.. وا بزانم
هێشتا بوارێکمان ماوە
یەخەی خۆمان
بدەینەوە دەست ئێوارەو
لـە زەرداوی خۆر نیشتنا
جارێکی تر مەلـە بکەین..
رەحمەت لـە تۆ ئەی کازیوە
کە بێزار نابیت لـە ئێمەی
پیری هێشتا پڕ لـە هەڵپە..
رەحمەت لـە تۆ ئەی گۆڕستان
کە توورە نابی لـە ئێمەی
ساردی هێشتا پڕ لـە کلّپە..
ئەی ناسکترین پیرەمێرد
رەحمەت لـە تۆ
کە رەنگەکانی منالّیت





خستە قوماشی بیجامەو
ملپێچو
بۆینباخەکەت..
ژێر زەمینێکت دروست کرد
بۆ بۆیەکانی پیرێتیو
بۆ نەخۆشیو.. ژانەکانت..
زامەکانی کە کۆتری برینداری
ناو قەفەزی سنگت بوون..
تۆ جگەرەت عاجز کردو
دانە دانە پەراسۆکانت خستە بەر
بەلوعەکانی منالّی..
ئیتر پشت کۆمانەوەی چی؟
پاییزو رووتانەوەی چی؟
رەحمەت لـە تۆ ئەی منالّی
کە گشت رەنگە کالّەکانت
لـە ناو خۆتا کۆ کردەوە..
کە هەموو ئاواتەکانت
لـە ناو خۆتا کۆ کردەوە..
(کەی جانتاکانی پیرێتی کۆ کەینەوەو
بێ پەساپۆرت بگەڕێینەوە بۆ شاری
بێ حکومەتی منالّی؟)
(کەی ئالاّکان دابگرینو
رەنگەکانی بخەینە ناو بووکەشووشە..
جا بۆ ولاّتی بێ شەڕو..
بێ کورتەی هەوالّو.. رەخنەو..

بێ موعاناتی منالّی، بڕۆینەوە؟)
(کەی لە سێبەری دیواری بەردەرگا
هەڵتوتکێین‌و..
هەڵماتێن‌و رەسم رەسمێنە بە دنیاو..
بە پەنجە باریکەکانی منالّی
یاری بە سمێڵە زبرەکانی دنیا بکەین؟)
رەحمەت لە تۆ ئەی یادگاری..
گەر تۆ نەبای
منالّیمان بزر ئەکرد..
گلۆپەکان خامۆش بکەین..
با پێکەوە کەلاوەکانی پیرێتی
تەعمیر بکەین..
(ئەی تۆپەکە.. فتبۆلّەکە..)
بەلاّم نەهێڵێن چەکوشی
گلەییەکانی کاملّبوون،
تۆپ لە دەستمانا بدڕێنێ..
رەحمەت لە تۆ ئەی شەمامەو
فەریکەنۆکی بەهاران..
منالّیتان لە کالّی خۆتان پێبەخشیم..
منیش ئیتر واز لە چەك‌و
پۆستاڵە قورسەکان دێنم..
منیش ئیتر گوڵە بەردەکانی پیری
ئەژاکێنم..
بەیانی زوو، برینەکانی پیریی خۆم
وەکو گەلاّکانی خەزان، ئەوەرێنم..





بە راکردن بەسەر پلیکانەکانا دێمە خوارێ‌و
بە راکردن بەرەو پۆلی یەکی بێی
قوتابخانەیەکی چوارباخ، ئەڕۆمەوە..
لەسەر تەختە پڕ لە هێڵ‌و نەخشەکانا
لە تەنیشتی منالّێکی چوارباخیدا دائەنیشم..
لە (دارا)وە ئەگەڕێمەوە بۆ کۆمەڵ
لە (یەك)ەوە خۆم ئەخەمەوە ناو دەریای
بێ کۆتایی ژمارەکان..
بۆینباخ‌و.. قۆپچەکانی مامۆستاکان..
قاورمەی دوای دەرسی پێنجەم..
مەتارەی یەکپارچە سەهۆڵ..
بەیانی زوو، موعاناتەکانی عەقڵ
ئەدەمەوە دەست یەکەم سەمونفرۆشی شار
ئیتر ئەگەڕێمەوە بۆ
قسە خۆشەکانی (دارا)و..
سێبەرە خۆشەکانی (دار)..

## لـه بەردەم دادگای لاهای

نازانم کێ
خەریتەی ویراسی تێکدامو
لـەجیاتی ئەوەی وەك باوکم،
خۆم بدەمە دەست نیشتمان،
خۆم کردە قوربانی،
پێنج دەقیقەی تەزیوی ژوان؟..
نازانم کێ،
دەمی ڕاپەڕینی لـەبیر بردمەوەو
دەمی (یار)ی
لێکردم بە سروودی نیشتمانی؟
چاوی یاری لێکردم بە سروودی کۆماری؟
من قومارم نەئەزانی
نازانم کێ
لـەسەر مێزی کچێکی خەمساردی
چاوڕەشی قۆشمە،
دڵی پێدانام..
شیعری پێدانام؟..
نازانم کێ
ڕۆژژمێری لێتێك دامو..
دانە دانە ڕۆژەکانم
کرد بە گوارەو
بە قردێلـەو..
شامپۆو.. عەترو..
نامەی زەردو وەنەوشەیی..
بە بێ ئەوەی کچێ لێمی وەرگرێو..





گوێچکەو..
قژو..
تاقی حەمامو..
توونی حەمامی پێبڕازێنێتەوە؟..
نازانم کێ
دابونەریتی لێتێك دام
لـەجیاتی سابونو
داستانو..
تۆفیق وەهبیو..
ئیمانو..
پاڵەوان، بنێرمە ئەورووپا"
کۆمەڵێ پیاوی سەقەتی
چاوبرسیو
ڕەنگ زەردو..
بۆ دۆلار پەککەوتووم
ڕەوانەی تولـە ڕێی قاچاخ کرد؟
من جاران لـە بەرم هەڵئەسان..
من جاران هەیبەتم،
چواردەورمی ئەترسان..
من جاران نە منالّی ئەنفالو
نە پیاوی ناو کەمپو
نە کچی بێ بەختم، شك ئەبرد..
من جاران، یۆنانم
تەنها لـەسەر زمانی هۆمیرۆس بیستبوو..
ئەزانم جەنگ بوو.. جەنگ، پەنجەرەی
ماڵـەکەی شکاندم

جەنگ بوو.. جەنگ، خەریتەو
هێلکاری ماڵەکەی دڕاندم..





## دراوسێیەتی

نێرێ لـە تەنیشتی مێیەك
رمبازی ئەكا..
مێیەك لـە تەنیشتی نێرێ
گۆرەوی ئەچنێ..
دایکم ئەیووت، بە تەنیشت
دیواری رووخاوا مەرۆ، مارو مێرووی زۆرە..
لـە تەنیشت ئاگرێکا
پشکۆیەك سووراوێکی تۆخ ئەکاو..
لـە تەنیشت جەنگێکا
بازرگانەکان تەندەرەکانیان هەڵدەدەن..
لـە تەنیشت پیرەژنێکا
بێجگە لـە خەوتن چی شك ئەبەی؟
لـە پاڵ مانگی چواردەدا
بێجگە لـە بێداری هیچ شك نابەم..
بە تەنیشت بازگەیەکا رەت بووم
پاسەوانەکان گیرفانەکانیان پشکنیم،
فیشەکێکی لامەم لـە گۆرەوییەکەمدا شاردبۆوە،
لـەبەر ئەوەی بیست ساڵی تر بلێم:
لـە تەنیشت رژێمەوە،
فیشەکێکم هێناو برد..
لـە تەنیشت شیعرەوە
فرمێسکو..
لـە تەنیشت شاعیرەوە،
مردن رژاوە..

که (با) هەڵئەکا،
بۆنی خوێنی لۆرکا ئەکەم..
که ڕەنگ هەڵئەکا
گوڵاڵە سوورەکانی سەر سنگی
گوڵسورخیم بۆ دێنێ..
لە تەنیشت ئاڵای کوردستان،
کۆمەڵێ دراوسێ ئەگرین..
نازانم بۆ؟
لە تەنیشت سنووری عێراق
کۆمەڵێ دراوسێ ئوتومبێل مینرێژ ئەکەن..
نازانم بۆ؟
لە تەنیشت کچێکەوە ڕۆیشتم،
فێری پەیمانی درۆ بووم..
لە تەنیشت برسێتییەوە ڕۆیشتم،
پەنجەکانم هەڵوەرین..
لە تەنیشت منداڵییەوە ڕۆیشتم
شەرمەزار بووم، چونکە من، منداڵیم
بە تەنیشت پیاوەتیدا ڕەت بوو..
نەمتوانی ئوتومبێل لە تەل دروست بکەمو
تایەکانی لە سەرەسۆدە..
نەمتوانی بە دەنگی بەرز هاوار بکەمو
کۆلارەیەك فڕێ دەمە گەرووی ئاسمان..
نەمتوانی شەوێ لە شەوان میز بکەم بە خۆما..
نەمتوانی خەوێ لە خەوان لەگەڵ پاپای
تەمێی دێوێ بکەم..





لە تەنیشت دەریاوە،
مردنو ژیان ڕەشو سپی ئەنوێنن..
لە تەنیشت کانیاوێ
کچێکی لادێ،
مەنجەڵە فافۆنەکانی سپی ئەکاتەوە..
کوڕێکی لادێ
چاوەڕوانی ئەو ساتەیە
کچە قۆخی کاڵی سنگی،
بە ئاو سپی ئەکاتەوە..
کوڕو کچ بە تەنیشت یەکتردا تێپەڕن
عەشق چەخماخە ئەدا،
بۆ ئەوەی چراکان داگیرسێنێ..
سیاسییەکان بە تەنیشت یەکترا تێپەڕن
سیخوڕ چەخماخە ئەدا،
بۆ ئەوەی جگەرەی لێوی جەنگ داگیرسێنێ..
لە تەنیشت تۆوە،
سێبەرێ ڕاکشاوە، سێبەری منە..
من لە عەشق تێنەگەیشتبوومو
بە تەنیشتیدا ڕەت بووم..
فەرمووی لێ نەکردم..
بە ئەندام وەری نەگرتم..
چونکە وەك بە تەنیشت پەیکەرێکا ڕەت بم
ئا بەو جۆرە بە لای عەشقا ڕەت بووم..
منداڵەکەم بە تەنیشت ئوتومبێلێکا ڕەت بوو
وتی: بابە.. دانەیەکی سوور بکڕە..

سوور وەك توت فەرەنگی..
نەمزانی چی پێبڵێم..
وتم: شۆفێرەکان هەموو قەڵەون
حەز ئەکەی باوکت قەڵەو بێ وەك فیل؟
وتی: نا.. نا.. مەیکرە..
هەر بە کۆستەر هاتوچۆ ئەکەین..
گوڵەکان درکیشیان هەیەو..
شەریش ناکەن..
گوڵەکان لە تەنیشت یەکترا ئەڕوێن..
بە بێ ئەوەی بیر لە سنوورو..
ئاڵاو..
پەساپۆرتو..
ئەمنی قەومی بکەنەوە..
پەپوولەکان لە تەنیشت یەکترەوە ئەفڕن،
بە بێ ئەوەی بیر لە چەکی قورسو..
دۆشکەی چوار لوولەو..
بەندیخانە بکەنەوە..
هێشتا دیوتانە پەپوولەیەك بدرێتە دادگا..
یان ببێتە دیکتاتۆر؟..
هێشتا دیوتانە پەپوولەیەك شێت بێ،
یان دەست بکا بە تیرۆر؟..
مناڵەکان لە تەنیشت یەکترەوە یاری دەکەن
بە بێ ئەوەی بیر لە چینایەتیو..
حیزبایەتیو..
نەتەوایەتیو..





ڕەگەزپەرستی بکەنەوە..
هێشتا مناڵێکتان بینیوە سوپا دروست کا..
یان سیخوڕ کۆکاتەوە؟
هێشتا مناڵێکتان بینیوە ئوتومبێل مینرێژ کا،
یا دەستێ ببڕێتەوەو..
زمانێ بزمارڕێژ کا؟..
ئەگەر دڵۆپەکانی باران
لە تەنیشت یەکترەوە نەبارن
ژیانیش ناگەشێتەوە..
ئەگەر حەرفەکان لە تەنیشت یەکترەوە دەست نەگرن
شیعریش ناتوانێ لە دایك بێ..
لە تەنیشت پێکەنینەوە، گریان
چاوەڕوانی ڕۆڵگێڕانە..
لە تەنیشت شاییەوە، شین
چاوەڕوانی پرسەیە..
ئەوەتا لە تەنیشت ڕۆژەوە، شەو
چاوەڕوانی سڕینەوەی ڕەنگەکانو..
بڕینەوەی دەنگەکانو..
داخستنی دەروازەی بازاڕو..
ماڵەکانە..
لە تەنیشت بێشکەوە، گۆڕو..
لە تەنیشت نانەوە، حیسارو..
لە تەنیشت گیرفانەوە، دزو..
لە تەنیشت دیموکراتییەوە، دیکتاتۆرو..
لە تەنیشت گەلی عەلی بەگەوە، تینوێتی،

چاوەڕوانن..
لە بەردەم دەرگاکەتان
چاوەڕوانی زۆرم کرد
نەمئەزانی تۆیش لە تەنیشت دەرگای
شا سوارێکی تر، چاوەڕوانیت..
نە چاوی بە چاوی من ئەچێو..
نە سمێڵو.. نە باڵای..
نە شیعری بە شیعری من ئەچێو..
نە مۆری پەنجەکانی..
لە تەنیشت حەلاڵەوە، حەرام چاوەڕوانە..
لە تەنیشت ویژدانەوە، خیانەت..
لە تەنیشت یارییەوە، شەڕ..
لە تەنیشت نیشتمانەوە، جەردەکان چاوەڕوانن..
لە تەنیشت ئاڵتوونەوە، ژەنگ چاوەڕوانەو
لە تەنیشت هەر ئاسکێکەوە، هەزار تفەنگ..
دوو ژووری دڵ خوێنی پیسو
لە تەنیشتیان، دوو ژووری پڕ لە خوێنی پاك..
بەڵام ئازیزەکەم، راستت پێ ئەڵێم:
کە بە تەنیشت مرۆڤەکانی هەزارەی سێیەمدا ئەڕۆم،
زیاتر لەوەی بە لای ورچێکا بڕۆم، خۆم ئەپارێزم..
کە لەگەڵ مرۆڤەکانی
بەردەم کۆمپیوتەر ئەدوێم،
زیاتر لەوەی لەگەڵ راجیمەیەکا بدوێم، ئاگادارم..
کە کچێکی جوان بۆم پێئەکەنێ
زیاتر لەوەی گۆریلایەك بەسەرما بنەڕێنێ، ئەترسم..





## حەسرەتنامە(*)

هەناسەیەك بدە کوڕم..
لە ژێر تیشکی گڵۆپە سووتاوەکانا
ئێمە شەومان دایە دەستی
رۆژانێکی رەشتر لە شەو..
نەمتوانی شینایی ئاسمان
بکەم بە فەزای ناو سنگم..
لە دیتنی پێلی دەریا،
تێرم نەخوارد..
ماسییەکم ئەویست ئەمشەو
بۆ دورگەیەکی لم زەردی
پڕ لە نەورەس، هەڵمگرێ..
گومان دانێو.. خۆت خوات لەگەڵ..
وەك من دڵت لەسەر مێزی
دڵەڕاوکێ نەدۆڕێنی..
وەك من رۆژانە تۆپی خۆر
لە دەفری چاوەڕوانییا، بزر نەکەی..
وەك من دەستت
بە دەقولبابی دنیاوە جێنەمێنێ
وەك من نەکەیت، بە دیار گەڵای
پاییزەوە رابمێنی..
کە ژیان بەردەوامە لە هاتوچۆ
لە گەردوونێکی گەورەدا

(*) بۆ لە دایکبوونی (حەمە)ی کوڕم.

ئەم هەموو خەفەتە بۆچی
کە دوو مێروولەین، منو تۆ؟
فرمێسك دانێو.. خۆت خوات لەگەڵ..
ئێمە دوو تارمایی لێڵی
ئەودیو هێڵە روونەکان بووین..
خەونمان بە هاوڕێیەکی تر
خەونمان بۆ کۆچی تەنیاییو
مەرگی خەم، تەرخان کردبوو..
کە تۆ هاتی،
پەنجەرەکان تێکڕا گریان..
دیوارەکان دڵخۆشی منیان دایەوەو
تابلۆیەکی مۆنالیزایان نیشان دام..
من قاوشی خەستەخانەو
میوانداریی نیوەشەوم پێ نامۆ بوو
ئەوەی لۆکەی برژانگەکانمی ئەگوشیو
تەزووی ئەخستە گلۆپە تاریکەکانی ناو سنگم“
ئەوە تۆ بووی.. بە خێرایی
تەونی جاڵجاڵۆکەی خەمو..
شەختەی بێ کەسیمت شکان..
من نەمتوانی هەموو دەمەکان شیرین کەم..
ئەترسام ئەو دینارانەی
بۆ کرێی خانوو دامناون
بتوێنەوەو.. جارێکی تر
نەگەڕێنەوە گیرفانم..
دەقیقەیەك شەقامەکان تۆزیان نەکرد..





دەقیقەیەك چەکوشو بزمار ئاشت بوونەوە..
تۆی ژێر قوماتێکی سپی
بە ترسەوە داوی سەرنجت
بە چاوی منەوە توند گرێدابوو..
هەناسەیەك بدە، کوڕم..
ئەزانم زەحمەتە.. زەحمەت
هەڵمژینی تەمو دووکەڵ
وەلێ ئێمە هەروا ئەژین..
تۆیش لە سەفەر بێزار ئەبی..
گەر گوێدێرم ئەبی ئەمشەو،
سەفەر دانێو.. خۆت خوات لەگەڵ..

## سەردەمەكانی بیابان

لە هەناسەیەكی غەریبیدا
تریفە مانگی ڕەنجاندو
ڕژایە سەر دەفتەرەكەم..
خوێن تینوێتی سنگمی نەشكان
تۆراو
ڕژایە سەر تارای پەنجەرەكەم
چۆلەكە سەری لێشێواو
لە پێش چاوی منالە چەتوونەكانا
هێلانەیەك پووشی چنی..
بەفر زاری لە گۆ كەوت و
دێڕەكانی باران لێل بوون،
خاك بوو بە هێمای مردنی..
حەسحەسەكان لە سروەی شەو
تێر ناخۆن و
شەقام هەر خەوتووەو.. خەوتوو..
چەتە بە تیشكی خۆر، خۆیان
حەشار دابوو..
لە پشت تەرمی نیوەڕۆوە
ڤالیۆمی خەویان تێكەڵی
خوێنی شار كرد..
دایكم ئەیووت:
(ئاگات لێبێ،
لافاو خۆی نەكا بە ژوورا..
ئاگات لێبێ لە چاوەڕوانی زیز نەبی..
دڵی بێداری نەشكێنی





چوار دیوارە بێ دەرگاو..
بێ پەنجەرەكەی
تەنیایی خۆت نەڕوخێنی)..
كە دایكم نانی ئەبرژان،
چۆلەكەكان مەقامیان بۆ ئارد ئەگووت و..
پشیلەكان
تازەترین نەخشەی ڕاوی چۆلەكەیان
تاووتوێ ئەكرد..
دەستی باوكم بۆنی بارانی لێئەهات..
شەو تا بەیانی لە بەردەم ڕادیۆكەیدا
بۆ سەربەخۆیی ئەگەڕا..
ڕێگا.. ڕێگا..
بە دوای بۆنی داركاژەكانی منالی خۆما گەڕام..
حاجی لەقلەقێ، بەیانی كۆچی كردو
لەگەڵ خۆی منیشی نەبرد..
قوتابخانەم تەواو كردو..
دارلاستیك و
تامی بەرسیلەم بزر كرد..
وێنەی كلاشینكۆفێك و
جامانەیەكم ئەنەخشان
لە ژێر دەفتەرەكانمدا شاردمەوە
بۆ بەیانی، توند گوێچكەیان ڕاكێشام و..
لە ژێر خانێكی شێدارا
وێنەیان لەبیر بردمەوە..
ڕژامە سەر شەقامەكان..
لە بۆنی سێو نائومێد بووم..

ئەمزانی خۆر ئاوا ئەبێو
هەر من خەوم لێناکەوێ..
مامۆستا گوێچکەی گرتمو..
وتی: (چیدی شتی یاساغ
لە دارشتنا مەنووسە)..
ئێوارە بوو،
شۆڤلێکیان سەرخۆش کردو
خانووەکەمانیان پێ رمان..
کۆشکێکیان هەڵخەڵتانو
چراکانیان کوژانەوەو
ئیتر کۆشکە بوو بە زیندان..
گۆڕەو شاریان لە گۆڕ دزیو
ناویشیان لێنا: زیندانی ئینفرادی..
ئێوارە بوو، ریزێ قولاپی قەساپیان
فریواندو
لەجیاتی هەڵواسینی مەڕ
فێری هەڵواسینی لاکی بەشەریان کرد..
چەپکێ وایەری کارەبای کۆڵانێکیان
فریواندو..
بە زۆر ناویان لێنا تێلاو
فێری کاری قامچیان کرد..
کلاویان لە سەری پانکەیەك ناو
لەجیاتی گڕدانی هەوا
لاشەی مرۆڤیان لـێ بار کرد..
دراوسێکانمان هەندەران گۆڕی کردن
دراوسێی نوێ هۆگرمان بوون





ئەو سروودانەی لە ریزی حەوشەی فێرگە
ئەمانچڕین
وەکو بۆنی دارکاژەکان لە یادم چوون..

## بازاڕ

كە تەور كەوتە داپاچین
ناڵەی درەخت چی بەسەر هات؟
شەماڵ، فێنكیی خۆی فرۆشت..
ئاسۆ، بێ دەنگیی خۆی فرۆشت..
كە پەپوولـە ناسكیی خۆی
بە بازرگانەكان فرۆشت،
چی بەسەر هات؟
كانی سەهۆڵی دا بە خۆر..
مانگ لـە برسا
خۆی بە توونی حەمامێ فرۆشت..
شار لـە ترسا،
هەرچی ئێسقانی بوو، شكا..
بوو بە تۆپەڵێ چەوریو گۆشت..
من بە بێكەس،
تەنیاییو نامۆییم كڕیو..
دەفری شەوچەرەو تاقمی
دانیشتنی ژووری میوانیشم، فرۆشت..
كاتێ ئاورم دایەوە
هەور ئاسمانی داگیر كرد
ڕووناكی بە بێدەنگی ڕۆشت..
ئەی زاناترین مێروولـە،
كە ئێوە شارتان جێهێلا
شەو، تاریكیی بە كێ فرۆشت؟
ئێوارە، زەردەی هەڕاج كرد،





كەس لێی نەكڕی..
ئەحكامی عورفی، تاریكی
شەوی لـەگەڵ ئەرزاق بەش كرد..
بڵێم چی، هەر تەنها خۆم بووم
كازیوە جریوەو جووكەی
چۆلـەكەی ناو داری فرۆشت..
(ئێمەیش ئەم جەژنەمان كردو
نەمانتوانی
تەعاروف بكەین لـە نێوان
مەنجەڵو گۆشت)..

## وانەیەکی تر

ئەرێ کەی بێم..
وانەی بێکەسیت پێبڵێم،
فێرت بکەم چاوەڕوانی
زەنگی تەلەفۆنو.. تەقەی
دەرگا نەکەی..
فێرت بکەم چاوەڕوانی
باڵی سپی نامە نەکەی..
ژووری میوان
بکەیت بە ژووری نانخواردن..
لە جەژنانا نوقوڵ نەکڕی..
فێرت بکەم
شەو بۆ گریان تەرخان کەیتو
ڕۆژیش بۆ خەو..
فێرت بکەم لەگەڵ دیوارو دار قسە بکەی..
فێرت بکەم
نامە بۆ خۆت بنووسیتو..
(بەیانی باش) لە خۆت بکەی..
فێرت بکەم
چۆن تەوقە لەگەڵ خۆت بکەی..
چۆن پیاسە لەگەڵ خۆت بکەی..
چۆن دڵی خۆت بدەیتەوەو..
بگەیتە ئەو ڕاستییەی
ئەم دنیایە هەر تۆی تیا هەی..
بگەیتە ئەو دەرەنجامەی:
ژیان هەر بەشی ئەوە ئەکا
کە خۆت بە خۆت بناسێنیو..





بتوانی لە خۆت تێبگەی..

## پرسیارنامه

ئەگەر چیا، تاوێری خۆی
نەدایە لـە پەنجەرەکان،
ئێوارەوەختە بۆنی خوێن
تێکەڵی چیمەن نە ئەبوو..
بۆچی من پەنجەکانی خۆم
لـەناو ئەڵقەی نارنجۆکا
عاسی ئەبوو؟..
ئەو خۆی تێکەڵی خوێن کردو
ئەمان وەك گەڵای پاییز، هەڵوەرین..
من چیم دابوو لـە گەمەکانی پەیژەو مار؟..
کە رۆژەکان جێیانهێشتم،
هەریەکەیان
پارچەیەك تابلۆی جوانیمی بۆ خۆی فڕان..
ئەگەر شەوان
دوو دێڕ نۆتەی بیتهۆڤن و
دوو چای قۆرییە فافۆنەکەم
تێکەڵی دەمارەکانم نەکردایە..
گەورە بووم و..
شەرمەزارم بڕۆمەوە ماڵی باوکم
لـە بەردەم دایکما بکەوم بۆ سروودێکی لایلایە..
لـە خوێنمدا (نا ئارامیی)،
بە ئێوارانا دەستی خۆی،
ئەخاتە گیرفانەکانی..
ئەرێ برا!
کەی سەردانێکی پار بکەین؟
ئەرێ زەوی!
کەی ئەمانگریتە خۆت،





هەتا کەی شارەو شار بکەین؟

## شیعری ناوەخت

نیوەشەو لـە دەرگا ئەدرێ
هەڵئەستم بیکەمەوە،
ژنەکەم ئەڵێ:
(بەم رەهێڵەو بارانە
بەم ناوەختە
لـە دزو درۆزن زیاتر،
ئەبێ کێ لـە دەرگا بدا؟)..
جارێکی تر لـە دەرگا ئەدرێو
خۆم کەڕ ئەکەم..
منداڵەکەم ئەڵێ: (بابە..
ئەوە دەرگاکەی ئێمەیە)..
ئەڵێم: (بنوو..
رەشەبایە..
ئەم کاتانە، لـە هەموو دەرگایەك ئەدرێ)..
چەندین جار لـە دەرگا ئەدرێو..
ژنەکەم ئەڵێ:
(نەخەڵەتابی بیکەیتەوە..
زۆرن ئەوانەی لـە بەردەرگای خۆیاندا
سەرو ماڵیان لێفڕاندن)..
لەگەڵ کازیوەدا دیسان
لـە دەرگا ئەدرێ..
ئەمجارەیان قیروسیای لێئەکەم..
ئەبینم شیعرێك لـە بەردەرگا
راوەستاوەو







سەرتاپای قوڕاوو.. باراناوە
تووشی ئەنفلۆنزا بووەو
یەك لـەسەر یەك ئەپژمێ..
لـەجیاتی بیبەم بۆ چاپ،
ئەیبەم بۆ بنکەی تەندروستی..
* * *
دەستێکم لـە گیرفانمایەو
ئەوەی تریان بۆ رەشەبا..
بەڵام هەردوو چاوم بۆ تۆ..
رۆمانێکم بۆ نیشتمانو
رۆمانێکم بۆ دایکم..
بەڵام شیعرەکانم بۆ تۆ..
* * *
من سەرئێشەم لـەگەڵدایە..
ساڵەهای ساڵ لـەگەڵ ناسنامەکەمدا
پارچەیەك حەبی ئەسپرین..
پارچەیەك حەبی پاراسیتۆڵ
پارچەیەك حەبی ڤۆڵتارین، هەڵئەگرم..
هەندێ جار لـەجیاتی ناسنامە،
حەبی سەرئێشە نیشانی
پۆلیسەکان ئەدەم..
هەندێ جاریش لـەجیاتی حەب،
پارچەیەك ناسنامە قووت ئەدەم..
* * *
خاڵخاڵۆکەیەکم تووشی ئەبێ لـە رێ

زۆر گلەیی لە لا ئەكەم
باسی غەدری قالۆنچەكانو
بێ وەفایی مێشەكانی بۆ ئەكەم
باسی لووتبەرزی پەپوولەكانو
بێ ئەخلاقیی كولـلەكانی بۆ ئەكەم
باسی باجی قورسی تەمەنو..
زامەكانی پیریی بۆ ئەكەم
پێموایە كردوومە بە هاورێ
كەچی كە دەگاتە سەر یەخەی كراسەكەم
بە بێ خواحافیزی هەڵئەفڕێ..





## كە خەوم ئەزڕێ

یەكی نیسان
بە درۆوە بڵێ: خۆشم ئەوێی..
یەكی نیسان
بە درۆوە ئەڵێم: رقم لێتە..

* * *

كە هەندێ جار
لەماڵەوە بەجێ ئەمێنم
قێز لە خۆم ئەكەمەوە..
كارەبای رۆح ئەبڕێو..
شیعرەكانم تێكئەچن..
بۆگەن ئەكەن..
رۆژنامەكان زەرد ئەبن
ئەبن بە پەن..
كەسێ شك نابەم بۆ لای بچم..
جێیەك شك نابەم رووی تێبكەم..
هەروا ئەمێنمەوە..
چاوەڕوانی سبەینێ ئەكەم
وەك ئەو كۆرپەیەی
لە وێڵاش بێزار بووەو
چاوەڕوانی لە دایكبوونە..

* * *

ئەتبینم،
وەك باران، بە پەنجەرەی نێوانمانا
دێیتە خوارێ..

وەك پەنجەرە، بە دوای بەردی
منالّە چەتوونەکانا، دێیتە خوارێ..
هاتوویت لە شیعرەکانی دوێنێما
پارچە زەوییەك بکڕیتو
کۆشکێکی لێدروست بکەی..
(شیعر نابێ بە نیشتمان)
بەڵام جاران
بە شاخەکانەوە
لە ناچاریدا
شیعرمان ئەکرد بە نۆردووە نان..
هاتوویت شتێ لە وەفام نیشان بدەی
هاتوویت بە گسكو خاکەنازەوە
پارچەکانی دڵم کۆ بکەیتەوەو
دڵێکی تەختەم پێشکەش بکەی..
هاتوویتو.. لەسەر کورسییەکی
تەریب لەگەڵ من دانیشتووی..
لەسەر منێکی تەریب لەگەڵ مردن
بە شەڕ هاتووی..
پێی ناوێ..
من چیدی بەکاری عەشق نەماوم..
من چیدی وشەی ناسکم پێنەماوە..
من چیدی دڵم بە دونیا خۆش نییە..
* * *
من بتەکێنن
کلیلی ئەو دەرگایانەم لێئەکەوێتە خوار





کە نەکرانەوەو.. نەکرانەوە..
تۆ بتەکێنن
ئەو پرسیارانەت لێئەکەوێتە خوار
کە پێت وەڵام نەدرانەوەو.. نەدرانەوە..
ئەم دونیایە بتەکێنن چی لێئەکەوێتە خوار؟
منی لێئەکەومە خوار
من.. کە هیچ پەیوەندییەکم بە دونیاوە نەماوە..
عەشق بتەکێنن، بارووتی لێئەکەوێتە خوار
بارووت بتەکێنن، مەرگی لێئەکەوێتە خوار
مەرگ بتەکێنن، ژیانی لێئەکەوێتە خوار
ژیان بتەکێنن، مەرگی لێئەکەوێتە خوار..
* * *
خۆرێ لە سەرەوە ئەسووتێ،
شارێ لە خوارەوە..
عەشقێ لە ناخەوە ئەسووتێ،
گوڵێ لە دەرەوە..
سیاسییەك لە سەرەوە تلیاك ئەکێشێ
سیاسییەك لە خوارەوە گیانی ئەکێشرێ
دەوڵەمەندێ،
لە دێوی ناو قۆرییەکەی عەلادین فێر بووە،
کە گیرفانەکان هەمووی بۆ خۆی بن..
هەژارێ لە مردووەکانی گۆڕستانەوە فێر بووە،
کە رۆژێکیان هەر لە برسا ئەمرێ..
چۆلەکەیەك لە سەرەوە ئەخوێنێ،
دارلاستیکێ لە خوارەوە رائەکێشرێ..

فڕۆکەیەك لە سەرەوە ئەناڵێنێ،
هەڵەبجەیەك لە خوارەوە ئەخنکێ..
چەندە بەختەوەرم، سیو حەوت ساڵە
بەسەر زەمینا دێمو ئەڕۆم..
نە ئاگرێکی سەرەوە سووتاندوومیو
نە بیرێکی خوارەوە فڕاندوومی..
چەندە بەدبەختم، سیو حەوت ساڵە
خەمێکی ناوەوە ئەمگرێنێو
خەڵکێکی دەرەوە، ئەمڕوخێنێ..

* * *

زانکۆ پێی وتم: ماڵئاوا..
لە موسڵ..
لە گۆشەیەکی نەقڵیات شیمال
دوو فرمێسك لە چاوما قەتیس مابوو..
تۆ پێت وتم: ماڵئاوا..
لە دەروونما
لە گۆشەیەکی تاریکی عاتیفەدا
هەزار شیعر سووتابوو..
زانکۆو تۆ..
تۆو زانکۆ..
بوون بە تانو پۆی خەونەکانم
رۆژێکم مابێ
ئەگەڕێمەوە بۆ زانکۆ
ئەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ
لە موسڵ
لە باخێکی ماتی کۆلێژی ئاداب





لەگەڵ تۆ
سەیری دووی کۆتری زانکۆ ئەکەین
لەگەڵ زانکۆ
سەیری دوو چاوی بێگەردی تۆ ئەکەین..

## دڵی کۆمپیوتەر

ئەوەی نیشانتدام
دڵی خۆت بوو یان هی کۆمپیوتەر؟
دڵ ئەسووڕایەوە..
بەو سکرینە سیزیۆمییەدا
یەك لە دوای یەك
وەکو دەنکی تەسبیحێکی قەزوان
وەکو بۆڵی تریێەکی دوورەدەست..
وەکو دەنکی شاتوویەکی
بەر رەشەباو..
منداڵە چەتوونەکانی خەبات..
وەکو رۆژە خێراو..
بێ ناوونیشانەکانی من..
دڵی سوور سوور،
وەك کۆمەڵێ فارگۆنی
روسیای بەڵشەفیك..
وەك شەوەکانی راسپۆتین، سوور..
وەك هەناسە ساردەکانی من..
(چووزانم.. وامئەزانی نامەیەك
بدەیتە کچێ‌و.. بڵێی: خۆشم ئەوێی..
ئەو دڵێکت نیشان بدا،
ئیتر وەك کەلیلەو دیمنە،
داستانێك ئەنووسنەوە..
وامئەزانی کچێ بڵێ: بیرت ئەکەم،
بیرت ئەکاو.. خۆشی ئەوێی..
خۆشت بوێ، رازی ئەبێ‌و
بیری بکەی، قبوڵ ئەکا
دوو هەنگاو پیاسەی لەگەڵ کەی)..
(من چووزانم..
وامئەزانی دڵی کچیش وەك دڵی من
سەحرایەکی چۆڵ‌و هۆڵەو
تینووی سایەی رێبوارێکە
پیا تێپەڕێ..
تێشنەپەڕی، لە دوور دیار بێ)
دڵ لە دوای دڵ..
دڵ جێی بە دڵ لێژ ئەکردو
دڵ سێبەری بۆ دڵ ئەکرد..
دڵ دڵی راو ئەناو..
دڵ عەتری بۆ دڵ هەڵئەداو
دڵ پەنجەی بە دڵ مۆر ئەکرد..
ئەوە چی بوو ئەو مانۆڕەی دڵو..
ئەو خۆپیشاندانی دڵو..
ئەو خەباتە چەکدارییەی دڵ؟
ئەوە چی بوو، ئەو سەمای پالێیەی دڵو
ئەو سێپێیی‌و..
ئەو سیاچەمانەیەی دڵ؟
ئەوە چی بوو ئەو سەنگەرو..
لافیتەو.. دەمانچانەی دڵ؟
وتم: شکم نەما، خۆشت ئەوێم..
ئەو دڵانە نامەکانی عەشقن‌و..

ئەبێ خۆم فێری ئەلفبای دڵ بکەم
ئەبێ خۆم فێری حونجەی دڵ بکەم..
ئەبێ وەکو کۆڵبەرەکانی بەهمەنی قوبادی
شوێن پێکانیان بخوێنمەوەو
ڕێگای قاچاخ بدۆزمەوە..
ئەبێ وەکو پۆلیسەکانی جینایات
پەنجەمۆریان بناسمەوەو
لە دادگادا قورئان بخەمە بەردەمیان..
لە دەرگا چوونە ژوورەوە،
لە پەنجەرەوە بڕوانم..
ئەمە دوا فرسەتی عەشقەو..
ئەمە دوا پەری تەنیایەو
لەم دائیرە کەئیبەدا
ڕێی ون کردەوەو
هاتۆتە ژوورەکەی من..
ئەمە دوا دەفتەری عەشقەو..
چیدی جەندرمەکانی پیری
بوار نادەن شیعری دڵداری بنووسم..
ئەمە دوا چاوی تاریکەو..
ئەمە دوا بزەی شیرینەو..
ئەمە دوا کچی هەنگوینەو..
چیدی بەعسێکانی پیری
بوار نادەن چاو بۆ هەتاو بکەمەوە..
ئەمە دوا بارانی ساڵەو..
ئەمە دوا سەوزایی ساڵەو..





ئەمە دوا قومی ڕووبارەو..
ئەمە دوا مەشهەدی عومرە..
چیدی بەعسێکانی هاوین
سەوزاییو ئاو تیرۆر ئەکەن..
(من چووزانم..
وامئەزانی کە کچ دەرگای والا کردو..
بە زەردەخەنەیەکەوە
شیرینییەکی بۆ گێڕای..
کە پێی وتی: بۆچی دیار نیت..
کە پێی وتی: ژوورەکەت ڕووناك کردەوە..
کە پێی وتی: تۆ لە دڵمای..
ئیدی ئەبیتە فەرهادو..
ئەبێ چەکوشێ پەیدا کەی..
بێستون خۆت بگرە وا هاتم)..
(من چووزانم کچی جوان بێ درۆ ناژیو..
ڕاستی دوورە لە کچی جوان)..
خوێن لە دەماری پشت دەستما،
نیازی ڕاوەستانی هەبوو،
بۆنی ناو گۆڕم لێئەهات..
وتم: شکم نەما، خۆشت ئەوێم..
ئەگینا ئەم دڵبارانە چییە نیشانم ئەدەی؟..
ئەگینا ئەم دلانە چییە خەساریان ئەکەی؟..
دڵی خۆت بوو، یان هی کۆمپیوتەر؟
ئیتر سەیری کۆمپیوتەریش ناکەم
بە تایپرایتەری (مومتازە)

شیعرەكانم چاپ ئەكەمەوە..
بەلایەنی كەمەوە ئەو دڵی درۆزنم نیشان نادا..
بەلایەنی كەمەوە ئەو هەڵمناخەڵەتێنێ..
بەلایەنی كەمەوە ئەو نامباتە سەر چەمو
بە تینوێتی نامگەڕێنێتەوە..
تۆزو خۆڵی سەر راستەو
حەرفەكانی ئەتەكێنم..
عوزرخوایی بۆ دێنمەوەو..
ببورە، بە دڵەكانی سەر شاشە هەڵخەڵەتام..
بە سوورایییەكانی ناو قوتوو هەڵخەڵەتام..
بە كچەكانی دوای یانزەی سێپتەمبەر هەڵخەڵەتام..
ئەزانم ئەو دڵی چاكەو
بە تەقەتەقی حەرفەكان
گۆرانی ئەو ساڵانە ئەڵێینەوە
كە بە عەرەبانەی دوو ئەسپی،
ئینجانەكانی عومرمان ئەگواستەوە..
كە هێشتا دڵ نەخرابووە ئەنتیگرێتەوە..
كە هێشتا گوڵی نایلۆن دروست نەكرابوو..
كە هێشتا درۆ تاوان بوو..
دزی تاوان بوو..
كە هێشتا گاڵتەپێكردن تاوان بوو..
كە هێشتا خیانەت لێكردن تاوان بوو..
لەگەڵ هەموو ئەوانەیشا،
هێشتا بەدگومانم.. خەریكە دڵنیا ئەبم لەوەی
خۆشت ئەوێم!..





گەر خۆشت نەوێم، ئەو تەسبیحی
دڵانەت بۆچی پچڕاند؟
ئەو هەموو دەنكە هەناری دڵەت
بۆچی هەڵوەراند؟
ئەو هەموو وشەیەت
بۆچی لە منا خەسار كرد؟
ئەو هەموو چركەیەت
بۆچی لە منا بەسەر برد؟
كە هەستامو.. بۆ تاهەتایە جێمهێشتیت،
هەندێ دڵ بە چاكەتو كراسەكەما،
فلیقابوونەوە..
هەندێكی تر لە پشت گوێچكەو گەردنما
وەك مێشی گۆڕستان، چەقی بوون..
نەمئەزانی.. نە.. لە مێژە مردوومو..
نەمئەزانی زۆرجار دڵ ئەبێتە فیشەكو
فیشەك ئەچێتە دڵو.. لە ناو دڵدا
قەیسەریو بازاڕی چەك فرۆشتنو..
تی ئێن تیو.. قاچاخچی هەیەو..
نەمئەزانی كچی جوان بە رێكەوتیش
واز لە درۆ ناهێنێ..
* * *
هەوڵ ئەدەم لە یادم بچی..
ئیتر سەیری گوڵ ناكەم..
گەر پەپوولە جگەرەی بۆ داگیرسانم،
وەری ناگرم..

ئەگەر ئەستێرەی بەیانی
دەستی تەوقەی درێژ کرد بۆم،
دەسی ناگرم..
هەوڵ ئەدەم لە یادم بچی
ئیتر کاتێ کە بەیانیان
تەریب لەگەڵ باخی گشتیو
گوڵزاری سەرادا رۆیشتم
چاو دائەخەم..
کە گوێم لە گۆرانی
(أحبك جداً)ی کازم ساهیر بوو،
گوێم دائەخەم..
کە دوو چاوی رەش رەشم دی
رووم وەرئەگێڕم
کە کۆمپیوتەرم بینی، رائەکەم..
کە پێیان وتم: (بیرت ئەکەم)..
بڕوا ناکەم..
کە پێیان وتم: (ماڵەکەم)
بڕوا ناکەم..
هەوڵ ئەدەم لە یادم بچی..
کە باسی خۆشەویستیم بیست،
ئەو مەجلیسە بەجێدێڵم..
کە بەهار هات، ناچمە سەیران..
گوێ لە سیمفۆنیا ناگرم..
کە ملوانکەی دڵم بینی
سەیری ناکەم..





کە..
کە..
کە..
* * *

## کاتەکان

سەعات هەشت بە کاتی هاوینە
چووم بۆ ئۆفیس..
سەعات چەند بە کاتی خۆشەویستی
تۆ دێیت بۆ لام
من بێم بۆ لات؟
سەعات پانزە بە کاتی هونەر
ئەچمە ناو کەمانچەکەی عارف
ئەچمە ناو فڵچەکەی ڤان کوخ..
فڕۆکە پەڵە پەڵەکان،
سەعات هەزارو دوو سەد بە کاتی سەربازی
خەردەلیان کرد بە سەرمانا
سەعات چوار بە کاتی لادێ
ئەچین بۆ تووتن شکاندن..
ئاگات لە ماری دێراو بێ..
سەعات چەند بە کاتی یادگاری
بڕۆینەوە بۆ ساڵی هەفتاکان؟..
لە کۆڵانە نیمچە تاریکەکانی گۆیژە
دەست بە دیوار بکەین؟
سەعات دوو بە کاتی منداڵی
خەو ئەبینم، فەرشەکەی
سندیبادم کڕیوەو..
بە ناو هەورەکانا ئەفڕم
هەتا ئەگەمە کۆشکی شازادەو
لە دوای حەوت ڕۆژ زۆرانبازی
ئینجا لێمی مارە ئەبڕن..
ئەڕۆمە سەر شەقامەکان





سەعات حەوت بە کاتی براکوژی
ئەمخەنە ناو ئۆتومبێلێکی وەك قەفەز..
سەعات هەشت بە کاتی دزی
شار وەك پرتەقاڵ پاك کرا
لادێ وەك گوێز شکێنرا..
عومر وەك ئەڵماس فڕێنرا..
سەعات چەند بە کاتی زستانە
لە بەردەم ئاگردانو سەماوەر
کوێر ئۆغڵو بخوێنینەوە؟
سەعات شەش بە کاتی باران
ئەچمە سەر پردی چوارەمو
سەیری مرواریيە ڕەشەکانی
ناو دیجلە ئەکەم..
سەعات حەوت بە کاتی بەغدا
ئەچم بۆ سوق عەرەبیو
هەمان سەعات ئەچمە شۆرجەو
گیرفانەکانم پڕ ئەبن لە بۆنی عەترو بەهارات..
سەعات چەند بە کاتی کۆڕەو
بچینەوە بۆ گۆخلانو.. دوو ئاو..؟
سەعات چەند بە کاتی ڕاپەڕین
سروودەکانی شڤان
تێکەڵاوی بەرچاییو..
بۆنی بارووت، تێکەڵاوی شەوبۆ بکەین!
چاکەتی نیلیو
پانتۆڵی خۆڵەمێشیو
کراسی سپی ئامادە کە
سەعات نۆ بە کاتی زانکۆ

ئەڕۆینەوە بۆ موسڵ..





## فەقیانەی پچڕاو(*)

تۆ لە ناو کەلاوەی عومرا
خەونت بە کۆشکی مەڕمەڕو
کۆشی شازادەوە.. نەدی..
خەونت بە ئالآی خۆتان
خاکی ئازادەوە، دەدی..
کێ جارێکی تر، ئەبێتەوە بە بارانو..
ئەرژێتەوە ناو بیابان؟
چ رۆژگارێ ئەبێتەوە بە جارانو..
ئەڕۆیتەوە
بۆ کۆڵانە ماتەکانی، سابونکەران؟
گەڵاکانی.. کە هەڵوەرین
رەنگە ببنە ئیلهامێ بۆ شاعیرێکی بێ نیشتمان
رەنگە ببن بە ئاوازی تارژەنێکی دوورە وڵات
بەڵام مەحاڵە جارێ تر،
چلێ باوەشیان پیا بکا..
مەلــێ لانەیان تیا بچنێو
هێلکەی کونج کونجیان تیا بکا..
تاڵەکانی قژت تێکڕا..
هەر لە بەهارەوە تێکەڵ
بە زستان بوون..
کاتێ شیعر بوو بە میوان..
ئەوێ زەمان تەنها سێگۆشەی برمۆدا

(*) ئەم شیعرە لە شەشەمین فیستڤاڵی گەلاوێژدا خەڵاتی سێیەمی وەرگرتووەو لە ژمارە (30)ی ئەیلوولی 2002ی گۆڤاری (گەلاوێژی نوێ)دا بڵاو کراوەتەوە.

دەیترساندی..
هێشتا پێت وابوو گوڵسورخی نەمردووە..
هێشتا پێت وابوو ساڵێکیان
نۆبڵ دەدەنە یەشار کەمال..
هێشتا پێت وابوو رۆژێکیان
داوای لێبوردن دەکەنو
هەر چوار پارچەکەی کوردستان
بە یەکەوە دەدروونەوەو
ئەیکەنەوە بەری خۆمان..
کێ هەمدیسان ئەبێتەوە بە بارانو..
چ رۆژگارێ ئەبێتەوە بە جارانو..
(گۆران لە کرەملین
بە ریژنە فرمێسکی باراند..
ئەمین فەیزەی لە خانەی پەککەوتەکانا..
نالی لەو سەحرای حیجازە)..
ئێستایش کەمانچەکەی دڵشاد
لە ئۆرکێستراکانا، ئەگری..
من ئەزانم ئەم چرکەیە،
زۆر شاعیر هەن
لە ناو کەمپەکانا ئەگرین..
پەڵە هەورێ
بۆنی پونگەی چوارتای لێدێو
لە ئاسمانی وڵاتێکی ئەسکەندنافی
بە خوڕ ئەگری..
چۆلەکەیەك رەنگی هەروەك شارەزوورەو





لە شەقامی شانزیلیزیە
جوکە جوکێتی ئەسووتێ..
3/16 لە ڤاتیکان،
پیاوێکی خنکاو بە شەقامەکانا
نابینایە..
هەر رادەکاو.. هەر رادەکا..
کۆرپەیەکی ساردوسڕیش لە باوەشیا،
ئەڵێ: (ئەوە باوکمە..
ناوی عومەری خاوەرە)..
لێی تێناگەنو
پێی ئەڵێن: ئەو ناوەمان نەبیستووە..
زارۆکێ لە ستۆکهۆڵم،
شەوی بەرات
بە توورەکەیەکەوە
ئەچێتە بەردەم ماڵەکان،
کەس دەرگای لێناکاتەوە..
باوکیشی دوای نانی جەژن
ستارخانی لەبەر دەکاو..
بۆ گەردن ئازادی ئەڕوا
بۆ لای تازە دراوسێکان..
دەستی بە زەنگی دەرگاوە سەوز ئەبێو..
کەس دەرگای لێناکاتەوە..
شەماڵێ بۆنی مێخەکی
قەیسەری نەقیبی لێدێو
لە دورگەی دۆمینیکان، ون بووەو..

جەندرمەکان، نازانن بە چ زمانێ
بیدوێنن‌و..
بۆ کوێی سنووورداش کەنەوە؟
دەمەیەك بۆنی گەڵای
گوێزەکانی بیارەی لێدێ‌و
لە چیای ئەڵپ..
زمانی لەگۆ دەکەوێ‌و..
ئەبێ بە پارچەیەك شەختەو
بزر ئەبێ‌و..
سەرلێشێواو،
لوتکەکان گاڵتەی پێدەکەن..
مۆمێك رەنگی منالە چڵمنەکانی
شەوی میعراجی پیرەمسووری گرتووەو
لە مۆمدانی کەنیسەی سانتا ماریا
باوێشك ئەداو.. ئەتوێتەوە..
تیشکی سەر رووخساری عیسا
ئەژاکێنێ‌و..
راهیبەکان لێی تێناگەن..
نازانن بۆ
ئاوا خێرا ئەکوژێتەوە؟
ساوایەك بۆنی دارکاژەکانی
مامەیارەی لێدێ‌و
لە باخچەیەکی ساوایانی بەرلین
ناتوانێ بە بەرد بڵێ (شتاین)
منالەکان دەورەی دەدەن





وەك کۆمەڵێ بێچووە هیتلەر..
وەك سابونێکی خوساوە،
سەیری ئەکەن..
سیاسەتمەدارێکی دیل
لە تاریکە کۆڵانێکی شاری دبلن
پەساپۆرتەکەی ون دەکا،
چوار وەرەقەی سەد دۆلاری بۆ گڕ دەداو
هێشتا هەر نایدۆزێتەوە..
کفتەیەکی سلێمانی
لە ناو پیتزاو ماکدۆناڵدو کنتاکیدا
رەق هەڵدێت‌و
کەس نییە دەستی بۆ بەرێ..
ترخێنەیەك قۆڵبەست ئەکرێ‌و
ئەخرێتە ژێر میکرۆسکۆب‌و..
دەدرێتە دادگاو..
بە تیرۆریست ناوزەد ئەکرێ..
ئەم تەسبیحە سی ملیۆن دەنکە
ئەم گەردانە سی ملیۆن موروو.. نقێمە..
ئەم فەقیانە سی ملیۆن سیمەو
سی ملیۆن نەخش‌و نیگارە..
چۆن وا پچرا؟
تۆ مەرۆ.. مە..
کۆڵەکەیەك بخەرە بنمیچێکەوە
دەستت بخەرە ژێر سەری کچێکەوە..
پێشان دونیا وا دروست بوو..

پاشان دونیا وا وێران بوو..
هەموو مانگێ..
سی دۆلارت بۆ دەنێرین
بابە نوئێلو
نیو شووشە عەتری هیوگۆو..
یەك فەردە جلە کۆنەی
کەنیسەکانت
بە ئێکسپرێس بۆ دەنێرین
بۆت ئەخەینە ناو پاکەتی زۆر جوانەوە
تۆ بە تەنیا بۆ خۆت بخۆ..
بۆ خۆت بژی..
بۆ خۆت بنوو
لە تەنیشت کوردستانەوە..





## شەڕ

لەپڕ تەمێ
پەنجەرەکان لێڵ ئەکاتو
منداڵەکە..
کۆترەکانی لـێ ون ئەبێ..
دایکەکە هەرچەن هەوڵ ئەدا
مۆمەکانی جەژنی لە دایکبوونەکەی
بۆ ریز ناکرێو..
شقارتەکەی، بە دەستێکی لەرزۆکەوە
ئەکوژێتەوەو..
لە ناکاوا
هەموو شتێ وێران ئەبێ..

## ئەمدیوی ژیان.. ئەودیوی مردن[*]

بەیانی، رائەچڵەکمو
ماڵئاوایی لە شەوو.. لە خەو ئەکەمو..
ماڵئاوایی ئەخەمە ناو
رووی ژاکاوی پێخەفەکەم..
کە سۆپاکە گەرم دادێ
ماڵئاوایی بۆ ئەو چیلکە شقارتەیەی
کە کاتێ ئەکوژێتەوە،
جارێکی تر نایبینمەوە..
ماڵئاوایی لەو چۆلەکە شڵەژاوەی
لە بەردەم پەنجەرەکەما
تاوێ خۆیم نیشان ئەداو
لەگەڵ جووکەیەکا ئەفڕێو
جارێکی تر نایبینمەوە..
دوای نیو سەعات،
ماڵئاوایی لەو پیاڵە چاییە گەرمەی
ئەیخۆمەوەو..
ماڵئاوایی لەو دینارەی ئەیدەمە بلیتی ئامانەکان
ماڵئاوایی لەو تۆوی گوڵەبەڕۆژەیەی
بە رێکەوت ئەیدۆزمەوە لە گیرفانما..
لە فەرمانگەیش، ماڵئاوایی لەو لاپەڕە

[*] کە زانکۆم تەواو کرد، زۆر گریام.. چونکە هاوڕێیەکی دێرینی (شانزە ساڵ)م، لەدەست چوو.. هەستم کرد بۆ هەتاهەتایە لیڤاکسو.. هۆڵی خوێندنو.. تەختەڕەش بێبەرییان کردم.. پاشان گەلێ هەوڵی دوورو نزیکم دا تاکو ئەو کەنارییە، ماڵی بکەمەوە، کەچی قبوڵی نەکردمو.. هەنووکەیش پیر بووم.. ئاخر خوێندن هاوڕێی پیری پێ قبوڵ نییە!..





ئەسمەرانەی ئەیانووسمو
جارێکی تر ناگەڕێنەوە بەردەمم..
ماڵئاوایی بۆ هەموو فرمێسکەکانم..
هەموو زەردەخەنەکانم..
ماڵئاوایی لەو کراسو پانتۆڵانەی
کۆن بوون.. مۆدێلیان نەماوەو
جارێ تر لەبەریان ناکەم..
ماڵئاوایی لە هەنگاوەکانم..
ماڵئاوایی لە هەناسەکانم..
ماڵئاوایی لە سەرنجەکانم..
ماڵئاوایی لە رۆژنامەکانی دوێنێ
کە هەواڵەکانیان ساردو سڕ..
کە لاپەڕەکانیان چرچو لۆچ..
ماڵئاوایی بۆ ئەو کەسانە جێدێڵم
کە لە بازاڕ بۆ یەکەمجارو
بۆ دواجار،
ئەیانبینمو..
ئەمبینن‌و
جارێکی تر نایانبینمو.. نامبیننەوە..
ماڵئاوایی ئەدەمە دەست ئەو شیعرانەی
کە خستوومنەتە سەر کاغەزو
جارێکی تر لە ناو ئاسمانی ئیلهاما
وەك شۆڕەبی نامهێنن‌و.. نامبەنو..
خەونەکانم بە رەنگەکانی منالیی
رەنگ ناکەنو

ئەچنە بەردەم ئەو خوێنەرە بێ رەحمانەی
یەك دێڕیان لێئەخوێننەوەو
توڕیان ئەدەن..
ماڵئاوایی لە دڵداری..
ماڵئاوایی لە گەنجیو.. لە هەرزەکاری..
ماڵئاوایی ئەکەمە ملی ئەو بارانەی
کە لە تینوێتی ناو خاکا، خۆی ون ئەکا..
ماڵئاوایی بۆ ئەو پەلکەزێڕینەیەی
بەرە بەرە ئەتوێتەوە..
ماڵئاوایی لە وشکایی زەمین ئەکەم
باران ئەیخوسێنێتەوە..
ئێوارەیش سەر هەڵئەبڕمو
ماڵئاوایی لە خۆر ئەکەم..
ماڵئاوایی لە رۆژێکی تر ئەکەمو
ئەگەڕێمەوەو
پەلاماری قەڵەمو کاغەز ئەدەمو
ئەکەومە ژماردنی ساڵ..
ئەکەومە ژماردنی مانگ..
ئەمەوێ بزانم عومری خۆمو
هاوسەرەکەم گەیشتۆتە چەند..
ئەی عومری منداڵەکانم..
عومری شۆڕشەکانی کوردو..
عومری حکومەتی هەرێم
ئەژمێرمو..
جارێکی تر ئەیژمێرمەوە..
رۆژژمێرێ لە بەردەما ئاوەڵایەو



كه بووم به خۆڵ

هەتاکو شەوێکی درەنگ
لە دەریای ژمارەکانا ئەمێنمەوە..

## دوو کۆتری بریندار

( 1 )

من گاو گەردوونی ئەو ڕێیەم
تیایدا نۆکمان بە فەریکەیی
ئەخستە ناو دەستی ڕنین..
بە دوای سەرابا ڕامانئەکردو
رووخساری گرژی دنیامان
دێنایە پێکەنین
(دێیت؟ جارێکی تر
تەپکە بۆ کوکوختییەکان بنێینەوە.. دێیت؟
دێیت؟ جارێکی تر بە دارلاستیك
نامەی دڵداری فڕێ دەینە ماڵە دراوسێ.. دێیت؟
ئامان!.. ئاگات لێبێ
کوکوختی بە ئاسانی پەڕو باڵی
لێئەبنەوە.. ئامان..
ئێستاش دەمم پڕ ئەبێ لە ئاو
کە یادی سێوە مزرەکان ئەکەمەوە
دەمانژەندە ناو لەپێکی پڕ لە خوێ.. ئێستایش..
ئێستایش چاوم پڕ ئەبێ لە ئاو
کە یادی ئەو کۆڵانانە ئەکەمەوە
تیایاندا دونیایەك بیرەوەریم نووسییەوەو
جێیشم هێشتن.. ئێستایش..
ڕقم لێت بوو، ئەی پۆستاڵ..
ڕقم لێت بوو، ئەی سروود..
ڕقم لێت بوو، ئەی بەرد.. ڕقم لێت بوو..





هەروا زوو، پەردەی خەونە
ئەرخەوانییەکانمتان دڕی‌و
پەلتان گرتم‌و
فڕێتان دامە مەیدانی جەنگ.. هەروا زوو..
هەروا زوو، بڕوانامەکەمتان دڕی‌و..
کەلەپچەتان لە دەست کردم‌و..
فڕێتان دامە زیندانی جەنگ.. هەروا زوو..
هەروا زوو، خۆری ئابتان
بە پشت ملم فێر کردو
گیرفانەکانم پڕ بوون لە لمی سەحراو
وەك مەیمونم لێهات.. هەروا زوو..
دایکم وتی: کوڕم.. بۆ وا زوو پیر بوویت‌و
ماندوێتیت لێئەتکێ.. بۆ وا زوو..
خۆ دوێنێ بوو، لەگەڵ (شابە)ی دراوسێمان
لەسەر چلورەیەك، قژی یەکترتان
دەسکەنە کرد.. خۆ دوێنێ بوو..
خۆ دوێنێ بوو، لەسەر (دەمی ڕاپەڕین)
مامۆستای تەربیە وەتەنیە،
دوو هەفتە لە قوتابخانە دەریکردیت.. خۆ دوێنێ بوو..
تۆ چی ئەڵێیت.. ئەی دایکی بێئاگاو دڵساف
تۆ چی ئەڵێیت؟
کوردستانیان لێکردین بە دورگەی واق واق..
تۆ چی ئەڵێیت؟
تۆ چی ئەڵێیت، گوڵیان لە هەموومان چۆڵ کرد..
تۆ چی ئەڵێیت؟

ئەورووپا بوو بە بەهەشتەو
هەموومانی گوناهبار کرد.. تۆ چی ئەڵێیت؟
کوڕەکەم هەر لە دایك بوو
داوای پاسپۆرتی لێکردم.. کوڕەکەم..
کوڕەکەم هەر لە دایك بوو،
حاشای لێکردم.. کوڕەکەم..
لە کوێ ئەبیت.. سبەینێ، کازیوەی بەیان
لە کوێ ئەبیت؟
لە کوێ ئەبیت، سبەینێ زوو لەسەر سنوور..
لە کوێ ئەبیت؟
لەگەڵم دێیت، ئەگەر ڕۆیشتم..
با تەنیایی نەمفەوتێنێ.. لەگەڵم دێیت؟
لەگەڵم دێیت، ئەگەر مردم
با پشیلە یۆنانییەکان
دەمو لووتم نەقرتێنن، لەگەڵم دێیت؟
کۆڵەپشتم، نیشتمانێکی بریندارە..
سنوورێکیان بۆ نەکێشاو
فیرعەونێکیان بۆ دانەنا.. کۆڵەپشتم..
دەورووپشتم بوون بە ئاغاو
لە ساتێکا هەڵیانلوشیم.. دەورووپشتم..

( 2 )

چاوەڕوان بووم لە دایك بێت..
گەڵا گەڵا زەرد ئەبوونو
ئەرژانە بەردەم پێڵاوە
هیلاكو تۆزاوێکانم..





ئەم گۆمە کێ دروستی کرد؟
ئەم مەلەیە کێ فێری بوو؟..
لە دایك بوویت،
دنیایش نەڕووخاو.. وەکو خۆی
هەر مایەوە..
حانووتەکە هەر گۆشتەکەی
ئەبرژانو
خەڵوزەکە
دائەگیرساو ئەکوژایەوە..
لە دایك بوویت
مانگ نەگیرا..
خۆر نەگیرا..
قەرەباڵغی پاسەکان
سواڵکەرەکان
ئەوانەی عەرەبانەکان رائەکێشن،
توانەوە..
چاوەڕوان بووم پێکەوە بگەڕێینەوە
دیسان شیری هەنجیرە نەگەییوەکان
سەری لێومان بسووتێنێ..
دیسان رادیۆ،
قژی لوولی ڕووداوەکان
دابهێنێ..
چا بکوڵێتو
سفرە خۆی ئاوەڵا بکا..
ئێمە لێرە لەگەڵ نان مشتومڕمانە..

ئەوان لەوێ فیشەك ئەكەن بە بەهانە..
مانگ تێپەڕیو..
ساڵ تێپەڕیو..
درەختەكانی گەڵاّیان پێوە نەما،
سەوز بوونەوە..
فیشەكەكان ژەنگیان هێناو
برینەكان بەرە بەرە
چاویان لێكناو
چاك بوونەوە..
هەر من بووم.. من بووم بێ جووڵە..
بە بێ هیوا، هەر پیر ئەبووم..
یەك پەڕە بووم..
یەك وشە بووم..
هەموو عومرم بەسەر بردو
نەمتوانی ببم بە ئەلبوم..





## دوا عومەر یان UN

سیو دوو ساڵ پێش ئێستا
گوڵ عومەر ناوێكی سواڵكەر
لە كن تەنەكەی خۆڵی بەردەرگا
هەڵدەتروشكاو
دایكم برنجو شلەی بۆ دێنا..
(شێخ عومەرە گریساوییەكەی بەغدایش
هەر كوردی تیا نیشتەجێیە)..
مێرمناڵ بووم،
عومەری هاوڕێم
لوغمی پیا تەقییەوەو مرد..
(سەرباز بووم
بوومە هاوڕێی عومەر ناوێ
وتی: ئەسكەریم پێناكرێ
رائەكەمو.. ئەبم بە جاش)
هەرزەكار بووم، عومەری خاوەر
چووە ئەلبومی شەهیدان
بەڵام من عومەری تریشم بیستبوو..
عومەر فەتاح، سەرۆكی هەرێمی خۆمان..
عومەر شاڵی، بەڕێوەبەری قۆناغی ناوەندیم..
عومەر دەبابە، مێژوویەك لە شۆڕش..
عومەر دزەیی، تاقانە خونچەكەی باخی گیانم..
عومەری سەی عەلی، سەركردەیەكی یەكێتی..
عومەر رەسام، شەهیدێكی تری هەڵەبجە..
عومەر شەریف، ئەكتەری بە ناوبانگی عەرەب..

عومەر موختار، رووخساری گەشی خەبات..
عومەر حەریری، دیسان ئەکتەرز..
عومەر شیرەمەڕی، سکرتێری یەکێتیی مامۆستایان..
عومەر عاشق، هاوڕێی باوکم..
عومەر خەیام، شاعیر.. فەیلەسوف.. زانا..
عومەری کوڕی خەتتاب، دووەم خەلیفەی راشیدین..
عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، یەکەم خەلیفەی ئومەوی..
مولازم عومەر، سەرکردەیەکی ئەم شارە..
عومەری سەلەفیو شەڕێکی ناوەخت..
لە سیاسەتی ئەمڕۆیشدا:
شێخ عومەری تاڵیبانو
شێخ عومەری ئەمەریکاو..
عومەر حەسەن ئەلبەشیر..
(عومرێکی پڕ لە عومەر بوو..)
عومەر ڕێشاوی، مامۆستای پڕ میهرەبانی..
عومەر سەرکارو کلارنێت..
عومەر چاوشینو رۆڵی ژن..
عومەر کەریمو خۆشنووسی..
عومەر عەلی ئەمینو شلە خەجێ..
(هۆمیرۆس هەر هۆمەرە)
عەرەبەکان وایان دەگووت:
(هۆمەریش هەر عومەرەو
عومەریش هەر عەرەب!)
پێمگووتن: (ئەی بۆچی هۆمەر
مام هۆمەرەکەی





ئەفسانەکانی ئێمە نەبێ؟)
بەڵام سەردەمێکە
نە عومەرێك ئەناسمو
نە ڕێکەوتی عومەرێ ئەکەم
نە هاوڕێیەکم عومەرەو
نە دراوسێیەکم..
نە نەخۆشێکی تاقیگە عومەری ناوەو
نە پاڵەوانی خەونێکم..
نە کەسایەتی چیرۆکێکم عومەرەو
نە لە شانۆگەرییەکا، عومەرێ ئەبینم..
بەڵام دوا عومەر لە ژیانمدا
عومەرێکی زۆر سەیر بوو..
نەنە ئافتاوی
هەشتا ساڵەی
چاو کۆری دراوسێمان
بۆی باس کردمو.. پێی وتم:
(ئەرێ کوڕۆ..
تۆ بە قەڵەمو قاقەزەوە خەریکی
پیێژن عومەری مچەحیدە
بەلوعەی نەوتەکە ئەگرنەوەو
پیێژن فەردەی ئاردمان
لێئەکەنەوە بە هەزار دینار
پیێژن..
بێژی راست کەن؟)..

## رۆژگاری تیغەکان

تیغێ نێوانمانی لەت کرد
ئیتر هەرچەن چۆلەکەکان
لە ژێر نمەی مەرکانەکان
خۆیان بشۆن..
لە دەرگای یەکتری نادەین،
چەند منالّم لە ناو خەونەکانما بینی
هەواڵێکی تۆم بۆ نەهات..
گوڵی هەموو ئینجانەکان،
بوون بە نایلۆن..
تەوقەی لە پێکی دڕکاوی..
پێکەنینێکی ژەنگاوی
نامەی بێ ناو..
بێ ماڵئاوایی.. بێ سلاّو
ئێمە بنمیچێك کۆمان ناکاتەوە
من بیر لە ماڵێ بۆ خۆم ئەکەمەوەو
گۆڕێ بۆ تۆ..
تۆ بیر لە گۆڕێ بۆ من ئەکەیتەوەو
کۆشکێ بۆ خۆت..





## گەڕان بە دوای دنیادا

لەگەڵ پەلەو
پۆلی مەلی ئێوارانا،
ئەو گۆزەیە بەسەر شانتەوەیە، نەشکێ..
(ئەو مۆمەی کە تۆ داتگیرسان
وەکو شەکر
لە ناو پیاڵەی تاریکیدا، توایەوە)..
گەلــێ شانو گۆزە شکان..
قژی بژو تەڕوبڕی گەلــێ بەهار
بوو بە قوربانی تینوێتیو
رووتایەوە..
دەرس وەرناگرن، دیوارەکان..
پەیکەرەکان..
تۆزی سەر گۆنای مێزەکان..
بزمارەکان..
(لە پشت ئەو قەدو
کراسو بۆینباخە گوڵ وردانە،
چەند توێیەك پێستو ئێسقان دێ..
پێسستو ئێسقان)..
شاری بێدەنگی گۆڕستان
پڕە لە پێست..
لە کاسەی سەر..
لە ئێسقان..
بڕوانە مۆزەخانەکان
پڕن لە تاج..

تیرو کەوان..
پڕن لە قاپو فەخفوری
کۆشکی پاشاو
شمشێری نەوەشێنراوی
قەدی سوڵتان..
لە پشت ئەو شووشەو مەرمەڕو گڵۆپانە
ریزێ کەلاوە پەنهانن
بۆ دەسەلاَت چاوەڕوانن..
بڕوانە بۆ کەلاوەکانی ئاشووروو
هەرەسنامەکانی سۆمەر
پایەو قوللە زامدارەکان..
لە پشت ئەو هەموو کۆشکانە
ژەنگو رزین چاوەڕوانن
ئەم دنیایە لە ناو شمشاڵی شوانێکا
شیرینترە.. بەرینترە لەو دنیایەی
چاو برسییەکان
لە ناو مانگی دەسکردەوە
بۆی ئەڕوانن..





## ونبوونی پارچە سێوەکان

تۆ برامیت
ئەتبینمو..
وەکو جاران،
سێوێ پێکەوە قاش ناکەین..
تێئەپەڕین،
چاومان تێکەڵی خاك ئەبێ،
لە یەکتری رۆژباش ناکەین..
ئەگەر دەستی من بگریتو
گوێ رادێریت“
هەستی لەرزین
مەراق خواردنی دەروونم، دێتە دەرێ..
چەن غەریبە
منو تۆ یەکتر نەناسین
نەك برا، وەك برادەرێ!..
دوێنێ پێکەوە ئەچووینە قوتابخانەو
دایکم بۆ دوای دەرسی پێنجەم
کولیچەی گەرمی ئەخستە جانتاکانمان..
بە یەك تەپکە،
ریشۆڵەمان راو ئەکردو
بە یەك فتبۆڵ
گوڵەکانی باخچەی باوکمان ئەشکانەوە..
بە یەك دەستیش،
سزای گوڵمان وەرئەگرت..
دە پێم بڵێ:

چەن ساڵ لـە هەمان ئاراوا
جلـەكانمان تێكەڵاو بوون؟
چەن ساڵ لـە ژێر هەمان ئوتوو
رووی توورەی كراسەكانمان
باڵای خواری پانتۆڵـەكانمان،
چاك كردو..
دە پێم بڵێ:
چەن ساڵ مەلی پەنجەكانمان
لـە يەك گيرفان
پێنج فلسی رۆژانەيان وەرگرت؟
تۆ براميت،
چۆن ئاگری ئەو چرايەت كوژاندەوەو
سەر پەنجەت نەبوو بە خەڵوز؟
چۆن بە لامدا تێپەڕيتو
گريان هەڵماتی ديدەتی غەرق نەكرد؟..
بە چ پەرۆيەك ئەو هەموو
فرمێسكانەت كرد بە پەلاس؟
خۆ جاران ئەو شيعرانەمان ئەخوێندەوە،
پەنجەرەكانيان، جۆگەلـەی
فرمێسك رێ بە رێی كردبوون؟
لـەسەر ئەو بەردە چڵكنە
تێپەڕينو
يەكترمان نەناسييەوە..
تۆ برام بوويت
گەلـێ داوی قژم بۆ تۆ





سپی كردو
گەلـێ دانيشم هەڵوەرين..
يەكترمان بەجێهێشتو..
تۆ، نازانم بۆ كوێ رۆيشتيت..
من، وەستامو..
سێبەری تۆ توايەوە..
من وەستامو..
رابوردوو نەگەڕايەوە..
كەوتمەوە رێو
پێچامەوە پرياسكەی
يادگارێكانم..
كاتێ ئاوڕم دايەوە،
پێچكەی زبری ئوتومبێلـێ
كوژاندييەوە شوێن پێكانت
شوێن پێكانم..

## سفر

دوو بەردم لـه یەکتر دا
ئاگریان پەیدا نەکرد..
دوو دەستم لـه یەکتر دا
چەپڵەیان بەرپا نەکرد
سەمونفرۆشی بەردەم
قوتابخانەی منالّیم
هەتا ئەو قاچاخچییەی
لـه جادەی سابونکەران
پەساپۆرتێکی ساختەی
بە زێڕ پێگۆڕیمەوە..
مێژوویەکی شێواوە..
ئەڵێی لـه بەربارانا،
بە حیبری تەڕ نووسراوە..
کۆمەڵێ پەلکە سێبەر
پۆلــێ زامی گەڕۆکن..
ئەو دەشتانە ئەپێون..
پەپوولـەن یان فڕۆکەی
جەنگە دۆڕاوەکانمان؟
هەورن یان ڕەوە کولـلـەن
یان سەرابی بڕیارە
لـەپڕ گۆڕاوەکانمان؟
مامۆستا هاتە ژووری
وشەی (دار)ی فێر کردین
بەڵام کە پۆلی دوو هات





داوای ئینتیماو
پارەو.. کۆبوونەوەی لێکردین..
لـه (دار)ەوە تا (زانکۆ)
جامێ بووم پڕ بووم لـه ڕق..
لـه یاخیبوون..
لـه پشکۆ..
نێوان پلوکە بەردو
گۆمێکی ماتو خامۆش،
ڕستێ شەپۆلی بازن،
هەواڵێ پەخش ئەکەن
نێوان بارانو زەوی
ملیۆنەها چڵە گیا
ئاوازێ نەخش ئەکەن..
دوو شیعرم لـه یەکتر دا
مشتێ حەرف هەڵوەرین
ئیتر نەبووم بە شاعیر..
دوو هەواڵم لـه یەکتر دا
یەکتریان کوژاندەوەو
هەردووکیان بوون بە سفر..

## هۆنراوەی تاشەبەرد

لەو كاتەوەی
دەمەی ترۆپكی كانونێ
بزنەكێوی كرد بە سەهۆڵ،
بە گڤەی با بڕوا ناكەم..
كە قابیل هابیلی كوشتو
یەخەی دڕاوی دایكم دی،
هەر هەمان كات
بڕوام بە گمەی كۆترو
گریانی كوكوختی نەما..
لە كۆڕی دەوری سۆپای شەو،
لە شەوچەرە، بەدگومانم..
كە بۆ خوان داوەتت كردم،
یەكەم پارووم دەرخواردی پشیلەكە دا..
كە جێگات بۆ داخستمو.. چاوم لێك نا،
نەخەوتبووم..
ترسام دەستێكی نهێنی
ئاگری خەنجەرێكی بۆ
سەربڕینم هەڵكردبێ..
* * *
گەر وا نییە،
ئەپرسم بۆ خەنجەرەكانمان هەمیشە
خوێناوینو
دوژمنەكانیشمان زامدار نین؟
دیوارەكانمان بە فیشەك





بوون بە هێڵەك
پەنجەرەكانمان بوون بە خۆڵ..
كۆشكی دوژمنەكانیشمان
مەرمەڕی سافو بێگەردن؟..
ئەو هەموو فیشەكە تەقین،
لاشەی كێ لە ناو سەنگەرا بەجێهێڵرا،
بێجگە لە تۆ.. بێجگە لە من
كێ داوی قژی سپی بوو؟..
كێ گیرفانی پڕ بوو لە قەرز؟..
كێ دۆلكەی ئاوەكەی شكا؟..
كێ چراكەی كوژایەوە؟..
كێ لە داخا، تاكو بەیانی بێدار بوو؟..
كێ لە برسا،
بەردو تەختەی لە سكی بەست؟
كێ لە قەهرا، بورایەوە؟
بێجگە لە تۆ.. بێجگە لە من؟
كە هەردووكمان مێرمناڵی گەڕەكێكین..
* * *
كاتێ كە ماڵئاواییت كرد،
دەرگاكانم بە كلیلو قوفڵ داخست
پەردەكانم دادایەوە..
ئەمە چەرخی نەخەوتنی چاوو دڵە..
بێداریی قاوەم خواردەوە..
لە بەرنامەی گەڕان بە دوای سەنگەرێكا
دۆسیەی خەوم

لـه چاوه‌كانم شارده‌وه‌..





## حه‌كایه‌تی به‌رئاگردان

ئێواره‌، شه‌رابی شه‌وی چۆڕبڕ كردو
زه‌رده‌، لـه ئاسۆ نیگه‌ران..
ئێواره‌، به‌یانی مردو
نیوه‌شه‌و، لـه‌پڕ نیوه‌ڕۆ لـه دایك بوو..
خاك هاته ئۆفیسه‌كه‌مان،
ئیمزایه‌كی خۆڵاوی لـه‌سه‌ر ده‌فته‌ری
به‌یانیانی كار، به‌جێهێشت..
ئیدی رۆی، نه‌گه‌ڕایه‌وه‌..
كه باران تێكه‌ڵی گڵ بوو،
تێر تێر بۆ باوه‌شی هه‌ور گریا..
كه كه‌وچك كرا به نێزه‌،
تێر تێر بۆ ئاوێزانی پارووی چه‌ور گریا..
ئه‌رێ بابه‌!
لـه‌و رۆژه‌وه‌ی بۆ ده‌فته‌ر نفوس
چووینه‌وه بۆ هه‌ڵه‌بجه‌،
هه‌تا ئێستا كه پیر بووم‌و
پرۆژه‌یه‌كم بۆ مردن،
هێشتا بابای رووگرژی بازگه‌ی شاره‌كان،
هه‌ر داوای ناسنامه‌و
مۆرو.. ئیمزا ئه‌كه‌ن..
به چاوی گا كرینه‌وه سه‌یرمان ئه‌كه‌ن‌و..
ئه‌یانه‌وێ وه‌حشێكمان تیا بدۆزنه‌وه‌..
ئه‌رێ ئه‌و ساڵه‌های ساڵه
نه‌یانتوانی ئه‌و پیاوكوژه‌ی

ئەو سیخوڕەی
ئەو تیرۆریستە، بدۆزنەوەو
پەل پەلی بکەنو.. رزگارمان بێ؟
ئەرێ بابە..
کەی بیجامەکەم لەبەر کەم؟
لە نێوان دەمو.. پارووەکان،
ئەو گەدەیەی کە تێر نابێ..
لە نێو پەڕەی دینارەکان،
ئەو گیرفانەی کە پڕ نابێ..
حەز لە کاری،
هەڵچنینی سەنگەر ناکەم..
شەوێك هاتن،
من بیجامەم لەبەر ئەکرد..
وتم: (من بەرد لەبەر ناکەم)
پێش کەڵەشێر
کازیوەیان پێچایەوەو
منیان لە ژێر رەشماڵەکانی
دوێنێ شەو، گڵ دایەوە..
شەوێك هاتن،
من خۆمم ئەکێشایەوە..
وتم: (خودە لەسەر ناکەم)
بەیانی زوو،
سیو دوو ددانو
بیست نینۆکی دەستو پێمیان،
بە تاڵان برد..





بە پەرۆیەك
پەیوەندی نێوان چاومو
زەردەپەڕیان تێکدایەوە..
هەرچی هەناسەم هەڵمژیبوو..
هەرچی هەنگاوم هەڵهێنابوو..
هەرچی پارووە نانم خواردبوو..
هەر هەموویان
بە بەیاننامەی یاساغو
تابووری پێنج لێکدایەوە..
بەیانی بوو..
بەیانی زوو..
شۆڕەبی کەزی خستبووە دەمی رووبار
بەڵام ئەو رۆژە زنجیرێ فیشەکی سوور
کرابووە گەردنی شار..

## بە رای من

( 1 )
درەخت
ئوتێلی وەرزەكانە..
( 2 )
حیزب
مارو پەیژەی
سیاسییەكانە..
( 3 )
دڵ سێوێكە
لـە خوان یاخی بووەو
لـە قەفەزی سنگا
عاسی بووەو
بەردەوام تەپڵی شەڕ ئەكوتێ
( 4 )
دیوار
فاریزەی نێوان مرۆڤەكانە..
( 5 )
تاریكی
ژووری نووستنی تیشكەكانە
( 6 )
دیكتاتۆری
خەونێكی منالّییە
( 7 )
شیعر





ئارایشتگای وشەو..
عیادەی فیكرو..
خانەقای زیكرو..
باخچەی شاعیرە..
( 8 )
خۆشەویستی
تەنافێكە..
بەهۆیەوە بۆ خواستەكانمان
ئەپەڕینەوە..
( 9 )
فیشەك
بۆ دژایەتی وشە دروست كرا
( 10 )
فیشەك
فێری هیچی نەكردین..
( 11 )
پەپوولـە
واتە ئەكرێ لـەم دنیایەدا
بە بێ چەكو
قەڵغانو
سەوڵـەجانو
گوڵـلـەبەندو
سیاسەت بژیت..
( 12 )
ژیان

كاروانێكه بۆ مردن..

( 13 )

دوو درەخت پێكەوە
دارستان دروست ئەكەن..
دوو مەلو..
دوو قوتابیو..
دوو هەنگ پێكەوە
پۆل دروست ئەكەن..
دوو تیشك پێكەوە رووناكیو
دوو لێو پێكەوە ماچ دروست ئەكەن..
كەچی
دوو سیاسەتمەدار پێكەوە
جەنگ دروست ئەكەن..

( 14 )

ئاگر رۆحی ئەو كەسانەیە كە ئەسووتێن
ئاویش گۆڕی ئەو كەسانەیە كە ئەخنكێن..
كە ئاو ئەچێتە سەر ئاگر،
كۆمەڵێ دوكەڵــی سپی
یان ئاڵای تەسلیمبوونی رۆح
هەڵئەكرێن..

( 15 )

تەمەن
گوریسێكە..
لە هەر چركەیەكدا
رێی تێئەچێ، بپچڕێ..





( 16 )

شەڕ..
واتا هەر كەسێك
لە ئاشێ ئەكات

( 17 )

ئاشتی
تەنها وشەیەكی رۆمانسییە

( 18 )

ئازادی
موڵكی شیعر بوو،
سیاسەتیش مافی بەكارهێنانی وەرگرت

( 19 )

درۆ، بۆیاخێكە..
هونەرێكە..
زمانو.. ئیمپراتۆرییەتێكە..
بە بێ درۆ
لە یەكتر حاڵی نابین منو تۆ..

( 20 )

پێم سەیرە
دۆڤیلیپین دۆڤیلیپا شیعر ئەنووسێ..
وەزیرو شیعر ناگونجێن..
هیچ ئامرازێكی پەیوەندی
ناتوانێ كۆیان كاتەوە..
شیعر وەكو كانی وایە
قەت ناتوانێ

لە كۆشكا چاو بكاتەوە..





## دوو دڵۆپە شیعر (*)

(دڵۆپی یەكەم)

پێم سەیرە، هێشتا لەم دنیایەدا
گوڵ ئەڕوێ..
بڵێن بە گوڵدان فرۆشەكان
چیدی قۆڵمان نەبڕن..
بە بێ گوڵ چی بكەین لە گوڵدان؟..
بەهار پەرێشانە بە دەست هاوینەوە
جیاوازی چییە لە نێوان
گوڵدانو
زیندان..

(دڵۆپی دووەم)

نیازم وایە لە سفرەوە دەست بكەمەوە بە دڵداری
هەست ئەكەم بە بێ دڵداری
رۆژ بە رۆژ پیرترو..
شەو بە شەو تەنیاترم..
ساڵ بە ساڵ بێ یادگاریو..
جەژن بە جەژن
بێ نوقوڵو..
بێ شەربەتو..
بێ میوانترم..

(*) ئەم شیعرە لە هەفتەنامەی (ئەدەبو هونەری كوردستانی نوێ) ژمارە (3516)ی رۆژی (2004/11/4)دا بلاّو كراوەتەوە.

## هەناسە تاریکەکان(*)

لە ژێر تریفەی فرمێسك و
هەنسکی ئەو ساڵانەدا
کە گەڵای گشت رۆژەکانی،
هەر لە شکۆفەوە زەرد بوون!..
ئەو گوڵانەی،
خەزان تیایاندا خەوتبوو..
ئەو دڵانەی،
یەکپارچە تووڕەیی و بەرد بوون..
(من بەزەییم بەم دەڤەرەدا دێتەوە..
دەستی راستم وەکو سەهۆڵ،
لەسەر برپڕەی گڕگرتووی پێنووسەکەم،
نەرم ئەبێت و ئەتوێتەوە..
فرمێسك رێی دێرەکان ئەگرێ،
لاپەڕەکەم تەڕ ئەبێت و
مرەکەبی پیتەکانیش،
کەم کەم بڵاو ئەبێتەوە)..
من بەزەییم بەم دەڤەرەدا دێتەوە
لافیتەی رەش
وشەی سپی،
ئەژنۆکانم سست ئەکەن و
شریتی گفتوگۆکەمان ئەپچڕێت و
سەرنج ئەدەم

(*) ئەم شیعرە لە ژمارە (4)ی پاشکۆی ئەدەب و هونەری یەکگرتوو رۆژی (1998/2/6) بڵاو کراوەتەوە.





هاوڕێکەم وەك مەلی برسی
راوەستاوەو حەرفی سپی
ئەچنێتەوە..
(ئاخ)و (داخ)یش وەکو پۆلــێ
کۆترە باریکەی بریندار
لە دەمییەوە
کەم کەم بڵاو ئەبێتەوە..
ئەڵێم: (هاوڕێ
ئەم تابلۆیە، خۆمان چڕمان
کردۆتەوە
وەك مانگاکەی گەلی موسا
وەك نازییەکان
گۆڕێکە خۆمان هەڵمانکەند
خۆمان تیا ناشت..
خۆیشمان پڕمان کردۆتەوە)..
ئەڵێ: (ئەو لافیتەیەیان
برادەری خوێندنم بوو..
بە دوای ساڵێکا ئەگەڕا
هەر چوار وەرزەکەی بەهار بێ
بەڵام حیسار
وای لێکرد هەموو هەوڵێکی
نانێکی پڕ لە ئازار بێ..
کێ ئەیزانی..
کێ ئەزانێ
چەند تابلۆی بەرز

چەند خەوی سەوزی بردۆتە
ئامێزی گۆڕ؟!
تەواو نابێ بە هەزار چلەی ماتەمی
بە هەزار کۆڕ)..
لەسەر ئەژنۆ ئەکەوێت و
سەری بەسەر سنگیدا شۆڕ
ئەبێتەوە..
تەوێڵی کەم کەم ئەلەرزێ..
دەرگای فرمێسك ئەکرێتەوە..
ئەڵێم: (هاوڕێ
ئەم قەدەرە، هەرەسی چاو قووچانێ
بوو)
ئەو هەر ئەگری
درەختە نەزۆکەکانیش هەر
وەستاون..
بێ گەڵا..
بێ بەر..
بێ سێبەر..
(باڵندەکانیش کۆچیان کرد)[1]
ئەڵێم: (هاوڕێ
بەسە مەگری..
حەرفی سپی واتە: تەواو..
هەستە با لە نوێ دایڕێژین
نەخشەی هەتاو..

---

[1] ناوی رۆمانێکی یەشار کەمالە.





نەخشەی هەنگاو..

* * *

هەڵئەستێت و
تەمی خۆری چاوەکانی
بە نەرمی ئەڕەوێتەوە
تیشکێکی نوێ
سەر دەردێنێ
کەم کەم بڵاو ئەبێتەوە

## هەناسەیەك لـه قەهر.. لـه ژەهر.. لـه كفر

ئەوەی دوو دەستی هەیە
هەوڵی دەستێكی تر دەدات
ئەوەی پشتێكی هەیە
ئەیەوێ بە پشتێكی تر
پشتێكی تر بشكێنێ..
ئەوەی چوار قاچی هەیە
ئەیەوێ لـەسەر دوو قاچ راوەستێ
ئێمە لـە دوورەوە ئۆتومبێلـەكان ئەبینین،
پێمان جوانن.. بەڵام
خاوەنەكانیان تەنها ئەو شوختانە ئەبینن
كە منالێكی ناحاڵی
كە پیاوێكی حەسوود
لـەسەر بۆنیتو دەرگاكانی كێشاویانە..
(من لـە دوورەوە تۆم خۆش ئەوێ
لێم نزیك مەبەرەوە..
نامەوێ شوختەكانت ببینم..
نامەوێ مۆری ئەو ماچانە ببینم
كە هەرزەكارێكی ناحاڵی
كە پیاوێكی شەهوانی
بە لێوەكانتەوە جێیانهێشتووەو
بەجێیانهێشتوویت..
نامەوێ هی من بیت
چونكە ئیتر جوانێكەت وەك جگەرەیەك
تەواو ئەبێو





ئەبێ حیسابی شوختەكانت بكەم،
ئەبێ حیسابی دۆستەكانت بكەم..
من لـە دوورەوە تۆم خۆش ئەوێ
لێم نزیك مەبەرەوە)..
خۆرێ هەڵدێ،
ئیتر ئەیكەین بە رۆژ..
مانگێ هەڵدێ،
ئیتر ئەیكەین بە شەو..
دیكتاتۆرێ دەرئەكەوێ،
دەشتو دەر ئەبن بە مەنتیقەی موحەڕەمەو
دەرگاو پەنجەرەكان پێوە دەدەین..
دیكتاتۆرێ دائەكەوێ،
دەشتو دەر ئەبن بە سەیرانگاو..
زیندانو..
حامیەو..
سەربازگا، ئەبن بە پاركی ئازادی
پەیكەری دیكتاتۆرێ ئەڕووخێ
منالێ قۆنەرەكانی دائەكەنێو
داخی دڵی،
بە سمێڵو
دەمی خوارو
چاوی سووری ئەڕێژێ..
هونەرمەندێ پێشنیار ئەكا،
بە قۆنەرەو
نەعلـە دراو،

پەیکەرێ بۆ عەلی کیمیایی
لە بەرامبەرا عومەری خاوەر،
دروست بکرێ..
(من لە دوورەوە رقم لێتە،
لێم نزیك مەبەرەوە..
ئەترسم رووبەڕوو
فرمێسکەکانت بخوێنمەوەو
سەهۆڵبەندانی تۆڵەم بتوێتەوەو
دومەڵانی بەزەیی
لە رەقەڵانی دەروونما، هەڵتۆقێ..
من لە دوورەوە رقم لێتە
لێم نزیك مەبەرەوە)..
پێشمەرگەیەك ناوی دێ
شانازی شەپۆل ئەداو
هەموومان دائەپۆشێ..
سەرکردەیەك بەسەر کیژۆڵەیەکەوە ئەگیرێ
شەرمەزاری شاڵاو دێنێو
ئەمانبا وەکو پووشێ..
(چەن خۆش بوو یەکترمان نەبینیایە
هەر لە دوورەوە ئاگامان لە یەك بووایە..
ئێمە وامانزانیایە ئێوە لە شاخ شەرەفی ئێمە ئەپارێزنو
ئێوەیش لاتان وابووایە ئێمە لە شار نیوەڕۆخەو ئەکەینو
خەریکی بیرۆح.. بیدەمین)..





## هەوڵێ بۆ راستکردنەوە

(یەکەم)

ئەوانەی دڕك ئەڕوێنن، بە هەڵە چوون، چونکە هەر دڕکە ئەبێتە پاسەوانی گوڵو.. هەر دڕکە ئەبێتە خزمەتکاری گوڵو.. هەر دڕکە ئەبێتە ئارایشتی گوڵو.. هەر دڕکە ئەبێ بە گوڵ..

(دووەم)
— ئاشتی —
نەگەبەتییەکە لەوەدایە
ئەوەی دان ئەدا بە کۆتر
بە زەحمەت ژنی ئەدەنێو
لە مەجلیسا لەلای دەرگا
دایئەنێنو
قسە بکا، پێی ئەبڕنو
پێی ئەڵێن:
(ئەقڵی سووکە..
بێ ئەدەبە..
کۆتربازە، گوێی مەدەنێ!)..

(سێیەم)
— دڕندە —
ئەو جەبانە..
لە ئاسكو کەروێشك زیاتر
کێ ئەشکێنێ؟
ئەو دەعبا لە خۆبایییەی

پێی ئەڵێن: (شێر)..
بە هەڵە نووساندوومانە بە ناوی شەهیدانەوە
بە هەڵە خستوومانەتە ناو ئالآو پایەکانەوە
هەر کە دەرکەوت،
دارستانی بۆ چۆڵ ئەکەین
هەر کە زیز بوو،
بارگەی کۆچو
راکردنو
نووشتانەوە، لە کۆڵ ئەکەین..
کۆڕەو بە پێ..
بە تراکتۆر..
لە ترسی لەتێ تەپەدۆر
ناومان لێناوە: دیکتاتۆر!





## دوورکەوتنەوە

لاپەڕە
لاپەڕە
لاپەڕە..
هەزارەها لاپەڕە
منو منالیمیان لێك جیا کردەوە..
هەنگاو
هەنگاو.. هەنگاو
ملیۆنەها هەنگاو
منیان لە بێشکە دوور خستەوە..
ئێستا هەموو چرکەیەکم
هەنگاونانە بەسەر مینێکا..
چاوەڕوانی کەوتنە چاڵێکە..
دینار..
دینار.. دینار
دینار سەرقاڵی کردم
کە لە ئاوێنەدا خۆم بینی
چل ساڵ
وەك چل تاشەبەرد
لەسەر شانم کەڵەکە بوون
کووڕ بوومەوە..
ئێستا تەنها خۆڵ ئەبینم
فیشەکی جەنگەکان،
لە ژێر زەمین خۆیان پێ شاردمەوە
کە بەئاگا هاتمەوە

بەفری کەلی خان لەسەر قژم باری بوو
نامەی دڵداریم لە یاد چوو
رووبارم ئەکردە ناو تانکی سەربان..
دیوانم ئەکردە کۆلارەی ئاسمان..
کە منالەکەم بوو بە هەرزەکار،
هەوڵی بڕوانامەی ماستەرم دەدا،
کە مردن هەوڵی مێژگردی دەدا،
لەگەڵ تەمەنم..
مۆم..
گڵۆپ..
چرا..
گوڵ ئەستێرەم داگیرسان..
شەو سەرقاڵی کردم،
نە نەوت بەشی چرای کردو،
نە شیعر بەشی دیوان..
نە کارەبا بەشی گڵۆپی کردو
نە گوڵ ئەستێرە هاتە هەیوان..
لە پشت ماڵمانەوە،
گەلەگورگ سەرقاڵیان کردم..
کە هوشیار بوومەوە،
یار لێم تۆرابوو..
ماڵەکەمان سووتابوو،
سوپەرمارکێتێکی تیا دروست کرابوو..
کۆترێ سەرقاڵی کردم،
کە خەبەرم بۆوە،





ریشۆڵەکان لێم زویر بووبوون..
رنوە بەفرەکان بووبوون بە تەرزەو
بۆنی کنگر بە ماسی
کۆڵانەکانی قانگ دابوو..
لەسەر سووچی گەڕەکەکەمان،
مردن شەپقەیەکی لەسەرا بوو..
مردن رەینکۆتێکی لەبەرا بوو..
کە ئەلف و بێی نوێیان دایە دەستم،
دەست بە دیوارو
پێنج بەردیەو
چاوشارکێ، تێکرا زویر بوون..
سەری خۆیان لێهەڵگرتم..
ئەمڕۆو دوێنێ وەك یەکتر وان..
کەچی لەپڕ
دنیایەکی تر دەبینم،
نە دەتوانم شیعری تیا بنووسم
نە دەتوانم جگەرەی تیا بکێشم
لەپڕ شەقام پڕ دەبن لە گەورە کچ..
لەپڕ بازاڕ پڕ دەبن لە هەرزەکار
لەپڕ خۆشنووسەکان،
هەزارەها لافیتەی رەش دەنووسن،
بۆ یەك کەس..
لەپڕ هەموو پەنجەکان هەڵدەوەرن،
لە پێناوی
بەردەوامبوونی چەقەنەی یەك دەس..

شەقامەکان دەستی یەکتر دەگرن،
شۆستەکانیش قاچی من..
چۆلەکەیەك ریقنەیەك دەکا بە سەرما،
تاکو سەیرێکی ئاسمان بکەم..
دنیا.. ئەو سابونە خووساوەیەی
تیایدا ساختمان دروست دەکەین..
دنیا.. ئەو سەرابەی
تیایدا چەکی قورس و
پیاوی سووك و
سەگی خوێڕی بەرهەم دێن..
دنیا، ئەخولێتەوەو
ئێمە، نەخۆش ئەکەوین..
ئەوانەی بەردەوام رادەکەن
وا ئەزانن دنیا وەستاوەو
ئەوان خاوەنی سەروەرین..
ئەوانەی کە دانیشتوون،
وا ئەزانن دنیا رادەکاو
ئەوان: شایەنی هەڵوەرین..
مارێ بە پەرێزێکا ئەڕواو
لە سەد لاوە،
بەردو
دارو
فیشەکی بۆ دێ..
دزێ لە کۆشکێکا ئەژی
لە سەد لاوە،





سەرو
سنگو
ئەژنۆی بۆ بە چۆکا دێ..
ئەم هەموو رۆژە پاڵ بە یەکەوە ئەنێن
وەك کۆمەڵێ منالی بێ ئۆقرە..
وەك کۆمەڵێ شاعیری بێ ئیلهام..
رۆژ هەیە هێندە درێژە
هەزار جار نانی تیا ئەخۆم..
هەزار شیعر دێنە لام و
چایی ئەخۆنەوەو ئەڕۆن..
هەزار جار ئەفلام کارتۆن..
هەزار جار هەواڵەکان..
هەزار جار کارەبا ئەبڕێ و..
هەزار جار رۆژانە ئەدەم بە منالەکان..
رۆژ هەیە ئەوەندە کورتە،
بەشی گۆرەوی لەپێکردنێ ناکا..
رۆژ هەیە نهێنییە،
وەك تلیاك..
وەك تیرۆر..
وەك ئەخلاق..
بە دزییەوە دەست پێئەکاو
بە دزییەوە ئەچێتە ژێر رەشماڵی شەو..
رۆژ هەیە ناکامە..
رۆژ هەیە خوێناوی..
رۆژ هەیە، تاریکە

هەڵنایەت چاوی..
شەو هەیە هێندە درێژە،
بەشی عابای هەموو ژنەکانی
ڕۆژهەڵاتو..
بەشی بێداریی هەموو شاعیرەکانی
ڕۆژئاوا ئەکا..
بەشی کلی چاوی هەموو کچەکانی لادێو..
بەشی ڕەنگی
هەموو شەربەت فرۆشەکان ئەکا..
شەو هەیە هێندە کورتە
بیکەیتە پیاڵەیەك قەنداخ، ڕەشی ناکا..
چاوێکی یاری پێ ڕەش کەی،
بەشی ناکا..
پێئەکەنم،
گریانیش لە پشت دەرگاوە ڕاوەستاوەو
هەر ئێستا بۆی نەکەمەوە،
دەرگاکەم بە شەق ئەشکێنێ..
نان ئەخۆم،
برسێتیش لە سەربان تەپەتەپ ئەکا
(کاسەو کەوچکم پڕ لە خۆڵ ئەکا)[1]
هەر ئێستا کلاوڕۆژنەی بۆ نەکەمەوە،
وەك ئاو بە بنمیچەکەدا،
دێتە خوارێ..

[1] ئەم دێڕە لە وانەیەکی کتێبی (ئەلفو بێی) نوێی پۆلی یەکەمی سەرەتایی وەرگیراوە کە مامۆستا (ئیبراهیم باڵدار) نووسەریێتیو بە داخەوە لەم دواییەدا ئەو کتێبە لە مەنهەجدا نەما.





شەو بڕۆ بۆ سەر شەقام،
ئەو هەموو خەڵکە چی بەسەر هات؟
ڕۆژ بچۆ بۆ سەربان،
ئەو هەموو ئەستێرەیە چی بەسەر هات؟
منالّیمان کێ بردی؟
هەرزەکاریمان کێ دزی؟
حەزم نەدەکرد منالّەکەم گەورە بێ،
نەمئەهێشت بچێتە دەرێ
هەموو شتێکم بۆ کڕی،
کەچی لە ناکاو گەورە بوو..
حەزم نەدەکرد شیعر بنووسم،
لەناکاو دیوانێ
سنگی شەق کردمەو
هاتە دەرێ..
هەست ئەکەم هیچم بە دەست نییە..
وەك چایخانەیەك وام،
شیعر چام تیا ئەخواتەوەو
چیرۆك تاوڵەم تیا ئەکا
دینار تیاما دەزرنگێتەوەو
ئاگری وەجاخەکە ئەمسووتێنێ..
دڵەڕاوکێ ڕەنگی ڕووم ئەباو
ئەوەی کە تۆزێ دڵم خۆش ئەکا"
دڵنیام کە ئەڕووخێم
دڵنیام کە ئەفەوتێم
دڵنیام لە یاد ئەچمو
لە قوڕنەیەکدا،

مێروولە، بەشێکم ئەباو
قالۆنچە، بەشێکی ترم..
سەگ، ئێسقانەکانم ئەباو
ڕۆژگاریش وشەکانم..
خۆ ئەگەر مردن نەبووایە،
ئەم دنیایە هەر بەشی هیتلەری ئەکرد،
هەموومانی لە دنیا بێبەری ئەکرد..





## گۆرانیی ماڵئاوایی (*)

دڵدارەکەم
ئەم ژوانە دوا ژوانە
ئەم وشانە دوا گفتوگۆن
دوا رازی نێوان منو تۆن..

* * *

دوا سەرنج ئەگرمە چاوت
خۆم ئەخەمە دوا شەپۆلی
قژی خاوت..
سەرم ئەخەمە ناو پۆلی
پەنجەکانت..
ئەبمە سیمفۆنیا بۆ نازو
لەنجەکانت..

* * *

دوا ژوانە
ئیتر چیرۆکی دڵداری نێوانمان
دوا کۆتایی دێ
ئیتر کاتی گینگڵدانو
تەنیایی دێ..
ئیتر تۆ لە من ون ئەبیو
من لە تۆ، ون
کێ ئەزانێ،
چەن ساڵو مانگ تێپەڕ ئەبن..

(*) ئەم شیعرە لە ژمارە (73)ی ساڵی (1988)ی گۆڤاری (کاروان)دا بڵاو کراوەتەوە.

کێ ئەزانێ
چیت لێدێ تۆ؟
چیم لێدێ من؟
* * *

دڵدارەکەم
ئەوا ئێستا
لە ژێر ئەم دارە پیرەدا
لەم بەیانییە دڵگیرەدا
لەسەر ئەم کورسییە دارەدا
لەم ساتە خەفەتبارەدا
دانیشتووین و
دوا دیمەنی شانۆگەری دڵداریمان
نیشان ئەدەین..
ئیتر ئەڕۆین..
ماڵئاوایی لە یەکتر و
لە شانۆی دڵداری ئەکەین..
ئیتر ئەڕۆین
لە دەروازەی
ئەندێشەو یادگاری ئەدەین..
* * *

دڵدارەکەم
هەر کاتێ خەزان دەرکەوت و
گەڵای دارەکان هەڵوەرین،
ئەو کاتە یادم کەرەوە..
هەر کاتێ شەوانی هاوین





ئەستێرەیەکت دی کشا..
هەر کاتێ پێکی تەمەنت
زۆربەی ڕژا..
هەر کاتێ کە بەفر باری و
پەلەوەرەکان کۆچیان کرد..
هەر کاتێ گورگی ڕەشەبا
هەڵمەتی بۆ ژوورەکەت برد..
ئەو کاتە یادم کەرەوە
ئەو کاتە لاپەڕەکانی
دەفتەری یاد هەڵدەرەوە..
* * *

بەڵام گیانە..
کاتێ بەهار
بە لەنجەو لار
سروشتی بە گوڵ و
گوڵزار ڕازاندەوە..
هەر کاتێ کە باران باری و
بەفری لووتکەی شاخەکانی
تواندەوە..
هەر کاتێ ڕۆژگار دۆستێکی
ونبووی بۆ لام
گەڕاندەوە
لەو کاتەدا
پڕ بە دڵ یادت ئەکەم و
باست ئەکەم

بۆت ئەگریمو لە خەڵكو خوا
داوای دەنگو باست ئەكەم..





## ژیان(*)

هەتا لەگەڵ شەوا ئەبمە هاوڕێ
ڕۆژ ئەبێتەوەو..
هەتا لەگەڵ ڕۆژ تەعاروف ئەكەم،
خۆر ئاوا ئەبێ..
هەتا پێستم لەگەڵ هاوین
ئاشنایەتی پەیدا ئەكا،
زستان بە ردێنی سپییەوە دێو
هەتا پەنجەكانم لەگەڵ تەزین،
ئەبنە هاودەم،
هاوین بە پشكۆی سوورەوە پەیدا ئەبێ..
هەتا دڵی تۆ ڕازی ئەكەم،
یەكێكی ترم خۆش ئەوێو
هەتا لەگەڵ ژیانا ڕادێم،
مردن ئەڵێ: پێشمكەوە..
ئیتر لێرەدا،
من تەواو ئەبمو
كۆتایی دێنم بەم خەوە..

(*) كافكا ئەڵێ: ژیان بریتییە لە دروستكردنی بازنەیەك لەلایەن هەر كەسێكەوە.. بەڵام من نەمتوانی هەرگیز ئەو بازنەیە دروست بكەم.. بەردەوام دەستم پێدەكردو دەچووم لە جێگەیەكی تر دیسان دەستم پێدەكردەوەو.. جێمدەهێشتو.. ئەچووم بۆ شوێنێكی تر، تا تەمەنم تەواو بوو بە بێ ئەوەی بتوانم بازنەیەك دروست بكەم.

## شەوو شیعرو شتی تریش(*)

رەنگە ئەمشەو بە تەنیایی
بۆ بنیاتنانی هەڵبەستێ
کاتژمێری دڵی ماندووم
لە حەسرەتا رابوەستێ
* * *
شەوێکە زۆر بە ئاشکرا
گوێم لە دەنگی دڵی خۆمە
شەوێکە.. تاریك‌و نووتەك
تەنها پێنووسەکەم مۆمە
* * *
تەنانەت ئەستێرەکانیش
لە ژێر باڵی شەوا خەوتوون
لە ناو دەریای تاریکیدا
گیاندارو بێ گیان نقووم بوون
* * *
چاوەڕوانم هەورێکی وێڵ
ئاسمان هێندەی تر رەش بکا
بەڵکو بروسکەیەك بداو
بۆ ساتێ زەمین گەش بکا..

(*) ئەم شیعرە لە مانگی یانزەی 1991 بۆ رۆژنامەی (هاوکاری)م رەوانە کرد، پاشان راپەڕین لە کوردستاندا رووی داو چارەنووسی شیعرەکەم بۆ روون نەبۆوە.. رۆژێکیان بە رێکەوت لە تەلەفزیۆنی کەرکوکدا، گۆرانیبێژێك کە نازانم کێیەو یەکەمجار بوو ببینم، ئەم شیعرەی منی کردبوو بە گۆرانی، ئەمە گومانی ئەوەی لەلا نەهێشتم کە لە رۆژنامەی هاوکاریدا بڵاو کراوەتەوە، پاشان ئەو برادەرە کردویێتی بە گۆرانی.. لە هەموو حاڵەتێکدا ئەم روونکردنەوەیە هیچ واتایەك نابەخشێ، ئەوەندەی ئاماژەیە بە وڵاتێك کە کەس ئاگای لە کەس نییە.





* * *
بەڵکو بارانێکی ناوەخت
ئەم شەوگارە بشواتەوە
دڵی تینوو تۆز لێنیشتووم
پێکێ باران بخواتەوە
* * *
ئەوسا هەڵبەستێکی مەزن
بە نمەی باران ئەنووسم
ئەوسا هەڵبەستێکی مەزن
بە یادی جاران ئەنووسم..
* * *
بەڵام زۆر زەحمەتە ئەمشەو
هەور بگری‌و باران داکا..
چونکە هەوریش خەواڵووەو
حەز لە گریان‌و زار ناکا..
* * *
ئای ئەمشەو لەم تەنیاییەدا
نازانم چۆن خۆم دڵشاد کەم؟
لەم تاریکی‌و بۆشاییەدا
چۆن خەمەکانم لە یاد کەم؟
* * *
ئەترسم تەواو بێزار بم
لە داخانا خۆم بکوژم
خوێنی پەنگخواردووی ناو دڵم
لەسەر مێزەکەم بڕژم

* * *

تۆ بڵێی خوێنی ناو دڵم
نەبێتە شیعرێكی مەزن؟
لەو شیعرانەی تا هەتایە
هەر ئەمێننەوەو نابەزن؟

* * *

بڕوا ناكەم خوێنی تووڕە
ببێ بە وشەی هۆنراوە
ڕەنگە ببێ بە هاوارو
بە شیوەنێكی نەبڕاوە..

* * *

بەڵام بۆچی ببمە شیوەن،
كە خۆم لە شیوەن بێزارم؟
نا ئەو خەمە پەنگخواردووە
ئەبەمە ژێر دوا هەوارم..





## سروود بۆ مانگرەكان(*)

( 1 )

لە بەرامبەر مانگرتوودا
مردن مردو چۆكی دادا..
مردن گریا..
وتی: ملیۆنەها ساڵە
هەرچی گیانداری خوا هەیە
لە بەرامبەر منا لاڵە..
لە بەرامبەر منا مەلێكی بێ باڵە..
كەچی ئەمڕۆ لە كوردستان
بۆ یەكەمجار ملم كەچ كرد
بۆ یەكەمجار ترسام لە كورد..
مردن ئەم قسانەی كردو
لە ژێر پێی مانگرتۆكاندا
سارد بۆوەو مرد..

( 2 )

مانگرتوویەك بە شارەكەیدا ئەگەڕا
مناڵێكی برسیی بینی..
مانگرتۆكە دەستی خۆی لە بنا بڕیو
دای بە مناڵەكە وەكو نان..

(*) ئەم چەند سروودە لە (1991/12/10)دا بۆ مانگرەكانی بەردەم (UN)ی سلێمانی نووسیمن و.. هەوڵم دا لە یەكێك لە شەوەكاندا، لە بەردەم ئاپۆڕەی خەڵكی سلێمانیدا بیخوێنمەوە، بەڵام بوار نەبوو، چونكە لەو شەوانەدا شاعیرو نووسەرێكی زۆر سروودیان دەخوێندەوە، ئەوا لێرەدا بۆ مێژوو تۆماری دەكەم، هەرچەندە سروودەكان زۆر بە سادەو ساكاری نووسراون.

ژنێکی هەژاری بینی،
قاچی بۆمبا پەڕاند بووی،
قاچی خۆی لە بنا بڕی و
دای بە ژنە قاچ بڕاوەکە..
خێزانێکی ئاوارەی دی،
قەفەزی سنگی دەرهێناو
کردی بە خانوویەك بۆیان..
گۆڕی شەهیدێکی بینی،
سەری خۆی لە بنا بڕی و
لەسەر گۆڕەکەدا کردی بە گوڵدان..
لە کۆتایی گەشتەکەیدا،
مانگرتۆکە تەنها هەر دڵی مایەوە،
هەر نەوەستابوو لە لێدان..
دڵیشی کرد بە مەدالیاو
دای لە بەرۆکی کوردستان..

( 3 )

ئەو ڕێگایەی جەبەل حەمرین
ئەبڕێو بەرەو بەغدا ئەڕوا،
دوێنێ لە ناکاوا پچڕا
جەبەل حەمرین سارێژ بۆوەو
ڕێگاکەی بەست
بیست و پێنج مانگرتووی توورە
پەنجا قۆڵ و مەچەك و دەست
لە بەردەم ڕێگای بەغدادا
بوون بە بەربەست





هاواریان کرد: جەبەل حەمرین بەردەوامەو
کەس بۆی نییە بێ پەساپۆرت
ئەم سنوورە ببڕێتەوە..
هەرچی زۆرداری دنیایە
ناتوانێ ناوی کوردستان
لە جیهانا بسڕێتەوە..

( 4 )

دوێنێ شەو لە نوێنی گەرما
خۆم ون کردبوو لە سەرما
لەناکاوا سەرینەکەم
دۆشەکەکەم
بەتانییەکەم، هەموو گریان..
وتیان: ئەوەیە پاداشتت بۆ کوردستان؟
لەپڕ سەرینەکەم ڕایکرد
دۆشەك و بەتانییەکەیشم
بۆ دەرەوە هەڵمەتیان برد
دیوارەکانی ژوورەکەم
یەك ئەوی تری لەناو برد
هاواریان کرد:
ئەبێ لەگەڵ مانگرتووان
مان بگرن هەموو گەلی کورد..

( 5 )

پێشمەرگەیەك
کەوتە بۆسەی
فاشست و ئەڵقە لە گوێکان

هەر چوار دەوری
بوو بە دەنگی گوڵلەو قەوان
لەناکاوا
هەر چوار دەوری پێشمەرگەکە
بوو بە سەنگەرێکی مەزن
جۆرەها چەك
کرایە رووی رەشی دوژمن
لە کۆتایی جەنگەکەدا،
دوژمن شکا..
حەیای تکا..
پێشمەرگەکە سەری سوڕما..
پرسیاری کرد: ئەی سەنگەری ئەفسووناوی
پێم ناڵێی تۆ پەیامی کام پێغەمبەری بەجێماوی؟
پێم ناڵێی تۆ کام فریشتەی؟
خدری زیندەی کام چیرۆكو سەرگوزشتەی؟
سەنگەرەکە وتی: هاوڕێ
ئەی شۆڕشگێڕی لە دیکتاتۆر هەڵاتوو..
من مانگرتووم.. من مانگرتوو..

( 6 )

مێژووی نوێی کوردم خوێندەوە
هەندێ پەرەی خوێناوی بوون
لە مێژوونووسێکم پرسی: ئەم پەڕانە بۆ خوێناوین؟
وتی: خوێنی شەهیدانە..
هەندێکیشی بریناوی بوون..
پرسیم: ئەی ئەم زامانە چین؟





وتی: دڵی دایکی شەهیدانە..
هەندێ لاپەڕەیش زەرد بووبوون..
– ئەی ئەمانە بۆچی زەردن؟
مێژوونووسەکە تووڕە بوو:
– ئەی نازانی ئەوە رەنگی وشکهەڵاتووی مانگرەکانی کوردن؟

( 7 )

دوێنێ بە شەقامەکانی شارەکەما
بە شەقامی شارە پڕ ئاوارەکەما، ئەگەڕام..
سواڵکەرەکان پێئەکەنین..
منداڵە بۆیاخچێکان دەستیان گرتبوو، هەڵئەپەڕین
سەرم سوڕما، پرسیارم کرد:
ئەی هەژاران چی رووی داوە؟
چی قەوماوە؟
منداڵێکی رووتەڵە پێی وتم: مامە..
ئەی نازانی مانگرتۆکان نانی ئێمەن؟
بۆ خێزانە ئاوارەکان، ماڵو خێمەن؟
ئەی نازانی مانگرتووان،
برسێتییان خستە ژێر پێ؟
ئەی نازانی ئیتر هیچ منداڵێکی کورد
برسی نابێ؟

( 8 )

شەوگار پرسی:
پێم ناڵێن ئەم جەماوەرە
بە چی ئەژین؟
هەور وتی: مانگرتۆکان نانو ئاوی جەماوەرن

شەوگار پرسی: ئەی پێم بلّێ ئەو کۆمەڵە مانگرتووە
بێ خواردنو بێ تێشووە،
بە چی ئەژین، ئەوا حەوت رۆژ رابردووە؟
هەور وتی: جەماوەرە نانو ئاوی مانگرتووە.

( 9 )

نانێ مانی گرتو وتی:
نایەڵم هیچ کەسێ بمخوا
هەرچی کەسە بۆ لای مانگرتۆکان بڕوا..
خۆ مرۆڤ هەر جەستە نییە،
بە خواردنو خەورازی بێ..
مرۆڤ ئەبێ
پێشمەرگەی سەرفرازی بێ..
مرۆڤ ئەبێ
رێژنەی گوللە ئاوازی بێ..
نانەکە ئەمانەی وتو
دەستی کرد بە پرمەی گریان..
تەڵێ شقارتەی داگیرسان
خۆیی سووتان..





## عەزیز سەلیم[*]

عەزیز سەلیم..
تۆ چۆن توانیت
لەم کۆمەڵە هەژارەدا
لەم کۆمەڵە بێزارەدا
لەم کۆمەڵە خەوزڕاوە بێدارەدا
لەم کۆمەڵە هەزار ساڵە
مل لە پەتی سێدارەدا
لەم کۆمەڵە زامدارەدا
لەم کۆمەڵە پڕ لە گورگە
دەم بە خوێنو سامدارەدا
تۆ چۆن توانیت،
جیهانێکی نوێ بەدی کەیت؟
تۆ چۆن توانیت،
داوای ژینی ئەبەدی کەیت
لەم شەوگارە نووتەکەدا،
تۆ چۆن توانیت،
ئەم چرا رووناکە هەڵکەی؟
ئەزانی تۆ
جێگای سەرسامی ئەو خەڵکەی

* * *

عەزیز سەلیم..

[*] لە هاوینی (1991)دا، هونەرمەندی شێوەکاری گەورەی کورد، عەزیز سەلیم لە ئەورووپا هاتەوە بۆ کوردستانو.. لە هۆڵی یانەی ئەندازیاران، پێشانگەیەکی کردەوە، منیش ئەم هۆنراوەیەم بۆ نووسیو دامە دەستی..

لـه ناو هێڵو ڕەنگەکانتا
هەڵـەبجەی ڕووخاوم بینی
ئازارو زووخاوم بینی
کوردی ئاوارەی بێجێگاو
شوێنم بینی..
دوژمنی چاو دەرپەڕیوی
دەمو ددان بە خوێنم بینی..
خوێنی ڕژاوی لۆرکام دی
لـەشی سووتاوی ژان دارکو
شاری ڕووخاوی ڕۆمام دی
خوێنی ڕژاوی ڤان کوخو
سەری پەڕاوی هنری مۆر..
دەنگی بڕاوی نیرۆداو
پۆشکینی لـە خوێنا گەوزاو..
خۆشەویستی دافنشیو مۆنالیزام دی..
خۆشەویستی ئەراگۆنو ئەلیزام دی
لـە ناو هێڵو ڕەنگەکانتا،
دەنگی سیمفۆنیای بتهۆڤن،
بەرز بۆوە..
گیانی ڤاگنەرو مۆزارتیش سەوز بۆوە
چایکۆفسکیش..
هۆنراوە خوێناوییەکانی،
مایکۆفسکیش..
* * *
عەزیز سەلیم..
یەکەمجارە لـە ژیانمدا..





لـە ناو قوڵایی گیانمدا..
هەست بە شانازی ئەکەم
یەکەمجارە چاوەکانم ڕازی ئەکەم
سەردەمێکی گەلـێ دوورە
بە دوای هونەری ڕەسەنا
بە دوای هونەری بێ کۆتو
بێ پێوەنا..
من ئەسووڕێمەوەو وێڵـم..
ئەوا ئەمڕۆ دۆزیمەوەو
ڕووناك بۆوە دیدەی لێڵـم..
* * *
بیکاسۆو ڤان کوخو سیزان
میلیەو لیۆناردۆ دافنشی..
دێلاکروا.. ڕۆبنس.. گۆگان
ئەنجیلۆو سلڤادۆر دالی
هەموو سەربەستو ئازاد بوون
بۆیە ناوبانگیان دەرکردو
بە پلـەی نەمریی شاد بوون
بەڵام تۆ ئەی عەزیز سەلیم
لـە شارێ چاوت هەڵهێنا،
هەموو کردارێ تاوان بوو..
هەموو هاوارێ تاوان بوو
لـە جیاتی هۆڵو گەلەریو
مۆزەخانە،
هەموو کوچەیەك زیندان بوو
هەموو هونەرمەندێکی ڕاست تاوانبار بوو..

خوێنی حەڵاڵــی
سوڵتانی گەورەی شار بوو..
پارەو ماڵی..
تەنانەت خەوو خەیاڵی،
بە ئەمری سوڵتانی گەورە،
ئەسووتێنران
یان ئەدزران بە حەڵاڵــێ..

* * *

عەزیز سەلیم..
تۆ پەروەردەی زیندانێکیت،
بە زۆر ناو نراوە – وڵات..
مرۆڤی تێدا سەر ئەبڕێ،
وەك باڵندەو مەڕو ماڵات..
سەربەستیو هونەرو
شادی
شتێکن وەکو خەیاڵات..

* * *

عەزیز سەلیم
تۆ دانیشتووی کۆمەڵێکیت،
تاکو ئێستایش
مرۆڤی تێدا ئەفرۆشرێ
کەڵەشێری هێلکە ئەکاو
نێر ئەدۆشرێ..
تاکو ئێستایش
نیوەی کۆمەڵ وا ئەزانێ
زەوی لەسەر پشتی (گا)یەو





(گا)یش لەسەر پشتی ماسییەو
ماسیش نوقمی ناو دەریایە..

* * *

عەزیز سەلیم..
تۆ دانیشتووی کۆمەڵێکیت،
هەزار ساڵە،
چاوی تەواو داپۆشراوە
دەستی کەلەپچە کراوە
تەنها فێری
هەناسەو خواردن کراوە..
عەزیز سەلیم، بە داخەوە!
گەلەکەمان ون کراوە
لە ناو جەرگەی دەریای ژینا
کەشتێکەمان کوون کراوە..

* * *

عەزیز سەلیم..
گەورەترین شۆڕشگێڕ تۆی
فلچەکانی تۆ گڕاوین..
ڕەنگەکانی تۆ خوێناوین..
تۆ توانیوتە زیندانەکان بڕووخێنی..
تۆ توانیوتە
یەخەی چارەنووس بدڕێنی..
تۆ توانیوتە
لە شەوگارا خۆت فێر بکەی
کەلەپچەکەت بپچڕێنی و

جەلادەکانت کوێر بکەی..

* * *

عەزیز سەلیم..
گەلەکەی تۆ وەکو مێروو
بە گازی ژەهرین ئەکوژرێن..
لە گۆڕێکا هەزاران کەس،
حەشار ئەدرێن..
لە بیابانە دوورەکانا،
هەزاران کەس،
هەر بە زیندوویی گۆڕ ئەکرێن..
گەلەکەی تۆ هەزار ساڵە،
بە دوای ئیسلاما رائەکاو
خۆشترین جێی سەر بەرماڵە..
کەچی تازە بە کافر لە قەڵەم ئەدرێو
لە ژێر سورەتی ئەنفالا
لادێو شاری کاول ئەکرێ
ماڵو سامانی ئەدزرێ
کچو ژنی مارە ئەکرێ
کەڵەپیاوی لە کۆتو سێدارە ئەدرێ..

* * *

عەزیز سەلیم..
تۆ لە تاریکی زیندانو خوێنی خۆتا
تۆ لە ناو زنجیرو کۆتا..
رەنگی تازەت دۆزییەوە..
فلچەت کرد بە چەکی شۆڕش..
ئەی بلیمەت.. ئەی شۆڕشگێڕ..





هەرگیز تۆ پێناسە ناکرێی،
بە هەندێ دێڕ..
تۆ ئەو کەسەی،
لەسەر سەهۆڵ ئاگرت بۆ گەل کردەوە
هەموو دوژمنان دۆڕاندیان
هەر تۆ گرەوت بردەوە..

## ژمارە پێوانەییەکان

چەند خۆش بوو تامی خورمای کوردکوژە
ئەو کاتەی کە هەر ماڵی توجارەکان،
نوقوڵی مینۆ و نەستەلـەیان هەبوو..
چەند خۆش بوو سواری پاسی پۆلۆنی
ئەو کاتەی تەنها مەسئولـەکان
مۆنیکاو نیسان پاترۆڵیان هەبوو
چەند خۆش بوو ئاوی مەرکانە
کە تەنها ئەوان سەهۆڵیان هەبوو
چەند خۆش بوو هەندەران
ئەو کاتەی نانەواخانەکانی نیشتمان
داخرا بوون..
ئەو کاتەی گیرفانەکانی نیشتمان
برِا بوون..
ئەو کاتەی رۆڵەکانی نیشتمان
لـە ناو خوێنی یەکترا بوون..
چەند خۆش بوو ئازار
ئەو کاتەی بە کیلۆ ئاردم ئەکرِیو
حەزم ئەکرد عەلاگەکانی دەستم
هێندە قورس بن
هەردوو قۆڵـم لـێبکەنەوە..
ئێسکەکانم لـێك بترازێن
پەنجەکانیشم هەڵوەرێن
چەند خۆش بوو تامی ساوەر،
ئەو کاتەی تەنها لـە دەرگای ماڵە شێخان
بۆنی گۆشتی برژاو، یاری بە کەپوومان ئەکرد..





چەند خۆش بوو خورشیدو خاوەر،
ئەو کاتەی نووسەر
ئەبوو خولی فێرکردنی زمانی کوردی
بۆ کۆمەڵێ رەفیق حیزبی، بکاتەوە..
ئەو کاتەی نووسەر،
ئەبوو هەموو رۆژێ بە وشە
پێڵاوو چەکمەی دیکتاتۆر بشواتەوەو
چڵکاوەکەی بخواتەوە..
چەند جوان بوو شەروالـی خام
ئەو کاتەی تەنها منالـی ئاغاکان
کاوبۆو فاسۆنو قەیفەیان لـەبەر ئەکرد..
چەند جوان بوو دلـۆپەی بنمیچی دار،
ئەو کاتەی تەنها ماڵی بەگ،
بنمیچی چیمەنتۆو
ستارەی سەربانیان هەبوو..
چەند خۆش بوو قەرز
ئەو کاتەی تەنها چەند کەسێ
لـە شارا گیرفانیان هەبوو..
چەند خۆش بوو ناوساجی
ئەو کاتەی بینینی کێك تەنها لـە فیلـمی
حسێن فەهمیو عومەر شەریفا بوو
چەند خۆش بوو تاراوگە
ئەو کاتەی ولاَت
لـە پێی یەك.. دوو عەریفا بوو..
چەند نەرم بوو بەرِەی دراو
ئەو کاتەی کە ئۆرتەی ئێرانیمان

لـه ديوەخانى ئاغاى
چيرۆكى لالۆ كەريما ئەبينى..
چەند خۆش بوو تەنيايى
ئەو كاتەى دڵداريمان هەر لـه فيلمى
سينەماو.. شيعرى نزار قەبانيدا
ئەبيست..
چەند شيرين بوو ترس
ئەو كاتەى مەداليای ئازايەتى
تەنها بۆ سەرسنگى
رەفيق حيزبى‌و
جاش‌و
مستەشار، كرابوو..
چەند خۆش بوو ژێر خێمەى ئۆردوگا
ئەو كاتەى كە شارەكەمان دزرابوو..
ئەو كاتەى نيشتمان
هەموو رۆژێ دوو جار فرۆشرابوو
سێ جار كڕابوو..
چەند خۆش بوو غەريبى
ئەو كاتەى لـەبەر بێ پارەيى
چەندين مانگ لـه بەشى ناوخۆى
زانكۆيەكى عەرەبستان،
كەروو تێى ئەداين..
چەند خۆش بوو خەوبينين
ئەو كاتەى واقيع تەنها لـەتێ نان‌و
دونيايەك خەم‌و ترس‌و دوودڵى بوو..
چەند خۆش بوو مردن،





ئەو كاتەى ژيان
پشكۆيەك بوو لـه دەستى چەپما
چەقۆيەك بوو لـه دەستى راستما
دوو بزمارى ژەنگاوى بوو
لـه چاوەكانما..
قولاپێ بوو بۆ هەڵواسينم..
بوتڵێكى شووشە بوو، ئەبوو لـەسەرى دانيشم..
خەردەل بوو
فسفۆر بوو..
چەند خۆش بوو درۆ،
ئەو كاتەى راستى لـه ئەبو غرێب‌و
نوگرە سەلمان‌و هەيئەى كەركوك
زمان سووتاو..
نينۆك دەرهێنراو..
بوتڵ تێبڕاو..
سندم لـه پێ..
هەتك كرابوو..
چەند گران بوو ناسنامە،
ئەو كاتەى لـه شەقامێكى سەد مەتريدا،
سەد جار داواى ناسنامەو
رەگەزنامەو
مۆڵـەتنامەو
هەموو نامەكانيان لـێدەكردين‌و
جا تفێكيان تێدەكردين..
چەند ناشيرين بوو ئەستێرەى ئاسمان
هەڵۆكانى ئاسمان

شمشێری جەنگاوەرەکان
ئەو کاتەی ئەستێرەو هەڵۆو
شمشێر لەسەر شانەکانی
سەددامو
دارودەستەکانی بوون..
چەند خۆش بوو سەری مانگ
ئەو کاتەی وەکو نەخۆش
مانگی سێ کەوچك دینارو
دوو حەب درهەممان هەبوو..
چەند ناشیرین بوو مێژوو
ئەو کاتەی دونیایەك لاپەڕەی زەرد
لە بەغدا دۆزرایەوە..
چەند پیرۆز بوو شەرمەزاری
ئەو کاتەی دونیایەك لاپەڕەی زەرد
سووتێنران..
دونیایەك خائین
لە حەمامی نیشتمانو
لە سالۆنی ئیعلامو
لە کوافێری هەرەشەو
لە سوپەرمارکێتی دۆلارا،
جوان کران..
چەند هەرزان بوو شەرەف..
چەند درۆ بوو خەبات..
چەند ریسوا بوو وشە..
چەند ترسنۆك بوو میللەت..
چەند پیرۆز بوو تف..





تف بە هەموو لایەکا
تف بە هەموو جێگایەکا
تف بە هەموو ڕێگایەکا
تف بە هەموو دەرگایەکا

## لـە خەوما[*]

(سەد جار وتم: خەو مەبینە..
کەی زەمانی خەوبینینە؟)
کۆمەڵێ درۆزن باسی تامی راستیی‌و
کۆمەڵێ داوێن پیس، باسیان لـە شەرەف‌و
کۆمەڵێ نەخوێنەوار، باسی
میشیل فۆکۆو
کۆمەڵێ ئاغاو بەگ باسی
رەوتی کۆمۆنیستیان ئەکرد..
(سەد جار وتم: خەو مەبینە..)
کۆمەڵێ دز، باسیان لـە دەستپاکی‌و..
کۆمەڵێ توونی حەمام، باسی رووناکی‌و..
کۆمەڵێ جەلاد، باسی ئازادی‌و..
کۆمەڵێ بایەقوش، باسی دڵشادی‌و..
کۆمەڵێ دیکتاتۆر،
باسی دیموکراتییان ئەکرد..
(هەزار جار وتم: بەسە خەو..)
کۆمەڵێ دارتاش، باسی مافی درەخت‌و..
کۆمەڵێ مقاش، باسی سەربەخۆیی‌و..
کۆمەڵێ کلاش، باسی سەروەری‌و..
کۆمەڵێ تەرەماش، باسی نوێگەرییان ئەکرد..
کۆمەڵێ قۆڵبڕ، باسی ویژدان‌و..
کۆمەڵێ سادی، باسی ئینسان‌و..

[*] پێشکەشە بە جەمیل صائیب.





کۆمەڵێ کولـلـە، باسی نان‌و..
کۆمەڵێ گولـلـە، باسی بنیاتنان‌و..
کۆمەڵێ سیخوڕ، باسی خیانەتیان ئەکرد..
(سەد هەزار جار وتم: بەسە..
خەو بووە بە درۆو دەلـەسە..)
کۆمەڵێ یاپراخ، باسی تەکنۆلۆژیاو
کۆمەڵێ ولاخ، باسی ئەنتیگرێت‌و
کۆمەڵێ تیمساح، باسی بەزەیی‌و
کۆمەڵێ میزراح،
سەرباسیان، رەگ‌و ریشە بوو..
(سەد جار پێم وتی: خەوبینین
یەك شەو خۆشە،
نەك ببێتە کالای بالای
پاییزو زستان‌و هاوین
.......)
کۆمەڵێ شێت، باسی ئەقڵی ئەلکترۆنی‌و..
کۆمەڵێ دینامێت، باسی کانی روونی بەر تریفەی مانگەشەوو
کۆمەڵێ نەهەنگ‌و گامێش،
باسیان لـە رێژیم ئەکردو..
کۆمەڵێ مێش، باسی پاکی‌و..
کۆمەڵێ کونە مشك،
باسیان لـە دەشتی کاکی بە کاکی‌و..
کۆمەڵێ منالی عەبوس،
باسیان لـە داهێنان ئەکرد..
کۆمەڵێ تەنەکەی زبڵ،

باسی تیۆری دوای نوێگەری‌و..
کۆمەڵێ بەکتریا، باسی چارەسەری‌و..
کۆمەڵێ بەرد، باسیان لـە نەرمونیانی‌و..
کۆمەڵێ گڕ، باسیان لـە شنەی شەماڵ‌و..
کۆمەڵێ خەڵوزیش، باسیان لـە شیرینی‌و..
کۆمەڵێ ئیبلیس، باسیان لـە بێ دینی‌و..
کۆمەڵێ مردوو، باسی لـە دایکبوونیان ئەکرد..
(سەد جار وتم: خەو مەبینە..)
کۆمەڵێ قەساب، باسی دڵنەرمی‌و
کۆمەڵێ قولاپ، باسی مافی ماسی‌و
کۆمەڵێ چەقۆکێش، باسی هەوڵی دیپلۆماسی‌و
کۆمەڵێ جرتکێش، دەروونناسییان باس ئەکرد..
(سەد جار وتم......)
کۆمەڵێ عەشایەر، باسی شارستانی‌و..
کۆمەڵێ شایەر، باسی رۆلان پارت‌و
کۆمەڵێ دۆنکیشۆت، باسی واقیع بینی‌و
کۆمەڵێ منالی ساوا، داوای نەجمەو دالیان ئەکرد..
کۆمەڵێ هیتلەر، داوای نەخشەی مارشالیان ئەکرد..
ئەبولـەهەب‌و ژنەکەی، داوای بەرماڵیان ئەکرد..
دەگمەن شایەك، داوای هەڵبژاردن‌و
گەلـەگایەك، داوای ئالایەکی سوورو
رەشەبایەك، باسی رۆمانسییەت‌و
گرانەتایەك باسی سەهۆڵاوی ئەکرد..
(سەد جار وتم: خەو مەبینە..)
قەرەجێ، باسی خاك‌و..





فرانکۆ، داوای خوێنی لۆرکاو..
شاهانشا، داوای خوێنی گوڵسورخی‌و..
نیرۆن، باسی بنیاتنانی رۆمای ئەکرد..
بێگانەیەك خانووی ئەکڕی‌و
خاوەن ماڵێکیش رای ئەکرد..
مەڕێ گۆشتی ئەخواردو
شێرێ باسی کای ئەکرد..
(سەد جار وتم......)
هێرۆیینێ باسی هوشیاری‌و
کۆکائینێ باسی ڕامیاری‌و
کافائینێ باسی بەختیاری‌و
نیکۆتینێ لـەسەر شانۆ سەمای ئەکرد..
قەلـێ باسی رووسووری‌و
گەلـێ داوای ئالای نەکرد..!
کە گەلێکی بێ ئالام دی،
لـەناکاو لـە خەو راپەڕیم..

## قسەیەك بۆ دز

لە دایك بووم پەشیمان بووم
لە مردنیش پەشیمان
لە منداڵیم پەشیمان بووم
لە پیاوەتیش پەشیمان..
لە برسێتی پەشیمان بووم،
كە تێریش بووم، پەشیمان..
تاكو ئێستایش تێناگەم،
لە پێناسەیەك بۆ ژیان..
ئەمەوێ بگەڕێمەو
لە گەڕانیش پەشیمان..
ئەوەی ساتێ لاوێتیمی
ڕەنگاوڕەنگ كرد،
پەلكەزێرینەی عەشقێ بوو
ئەویش نەیما ناوو نیشان..
ئەوەی ڕەنگاوڕەنگی كردم،
عەشق نەبوو،
چونكە پێش ئەوەی دەركەوێ،
نغرۆی كردم
ناپاڵمو
راجیمەو
كیمیاویو لوغمی
شكو گومان..
من لە عەشق پەشیمان بووم
لە تەنیاییش پەشیمان..





پەشیمانم لە بەهار..
لە هاوینو پاییزو..
پەشیمانم لە زستان..
پەشیمانم لە هاوار
لە لافیتەو لە شیعار..
لە ئەی ڕەقیبو
ڕەنگو بۆیاخی سەركردەكان..
پەشیمانم لە (مژدە)..
لە فیكەو.. تەقەی خۆشی..
لە مێزگردو.. لە وتار..
لە هەزارەها بڕیار..
پەشیمانم لە ئیلهام..
پەشیمانم لە شیعر..
پەشیمانم لە باران..
لە پێكەنینو گریان..
پەشیمانم لە باوكم..
پەشیمانم لە دایكم..
پەشیمانم لە خێزان..
پەشیمان لە دەمو..
لە چاوو..
گوێچكەو..
زمان..
پەشیمان لە كتێب..
لە دەفتەرو..
لە پێنووس..

هەروەها لـه
ن ی ش ت م ا ن..





## تیۆری نیسبی

ئێوه منالّتان دیوه بگری؟
منالّێكم دی ئەگریا..
هەر ئەو نەبوو،
دارخورمایەكیش ئەگریا..
سەماوەرێ،
مەركانەیەكیش ئەگریا..
دارگوێزێكم دی ئەگریا..
هەر ئەو نەبوو
سۆرەیەكیش ئەگریا..
پنچكە گیایەك
قومە كانییەك، ئەگریا..
هەر ئەو نەبوو
تاشەبەردێكیش ئەگریا..
كۆمەڵێ رۆژ
كۆمەڵێ ژنی رەشپۆشیش
پزیسكە ئاگرێ ئەگریا
هەر ئەو نەبوو
هەموو رابوردوویش ئەگریا
ئەمرۆم دی بە خوڕ ئەگریا..
هەر ئەو نەبوو
سبەینێش بە خوڕ ئەگریا..
ئێوه گۆڕتان دیوه بگری؟
من گۆڕێكم دی ئەگریا..
رۆژنامەیەكیش..

پەیامنێرێکیش..
هەر ئەو نەبوو..
شاعیرێکیشم دی ئەگریا..
سەعاتەکەیشی..
پێنووسەکەیشی..
دیوانەکەیشی..
تەنها دڵدارەکەی پێئەکەنی..
ئێوە ولاّتتان دیوە بگری؟
ولاّتێکم دی ئەگریا
ئالاّکەیشی..
دروشمەکانیشی..
دەستوورەکەیشی..
تەنها سیاسییەکانی پێئەکەنین..
ئێوە سیاسیتان دیوە بگری؟..
گۆڤارێکم دی ئەگریا..
پیتچنەکانیشی..
هەڵەگرەکانیشی..
نووسەرەکانیشی..
تەنها سەرنووسەرەکەی پێئەکەنی!
ئێوە سەرنووسەرتان دیوە بگری؟..



## وتەیەك

حەز ناکەم ئەو کتێبانە بخوێنمەوە کە لە سەرەتای کتێبەکەدا (پێشەکی)یان بۆ نووسراوە.. تۆ هاتوویت بابەتێك بخوێنیتەوە، نەك پێشەکی.. هەربۆیە لە کۆتایی ئەم دیوانە بچوکەدا حەزم کرد وتەیەك لەجیاتی پێشەکی بنووسم.. ئەم شیعرانە لە کاتو شوێنی جیاجیا نووسراون، بە رای من نووسینی کاتو شوێنی شیعر، تاوانێکە بەرامبەر بە شیعر، چونکە شیعر هیچ پەیوەندییەکی بەم کاتو شوێنانەوە نییە کە ئێمەی تێدا دەژین.. هەربۆیە بە کاتو شوێنکردنی شیعر، بەستنەوەی شیعرە بە دوو کۆڵەکەی کۆنەوە.. بە دوو رۆتینی کۆنەوە.. هەروەها کۆنکردنو کۆنکرێتکردنی شیعرە.. من حەقم چییە گۆران کانییەکی روونی بەر تریفەی مانگەشەوی کەی نووسیوە؟ یان لە کوێ نووسیوێتی؟ گرنگ ئەوەیە نە ئەو کانییە هەرگیز وشك ئەکاتو.. نە هەرگیز لێڵ ئەبێتو.. ئەو مانگەیش.. ئەو تریفەیەیش، هەرگیز تاریك نابن..

هەروەها بە گشتی من ئازادیم داوە بە خۆم هەموو قسەیەك بکەم، چونکە کە شیعر خرایە ناو قاڵبی دەسەلاّتو رەقابەو ئەو شتە داهێنراوانەی ترەوە، ئەو کاتە شیعر دەبێتە یەکێك لە دەسکەوتەکانی دەسەلاّتو.. لە هەموو شتێك ئەچێت لە شیعر نەبێت.. ماوەتەوە بڵێم من بە چەندین ناوو نازناوەوە شتم بلاّوکردۆتەوە وەکو (نەوزاد بەندی، سانا، حەمە، حەمەدۆك)، دواجار بە ناوە سروشتییەکەی خۆمەوە کە (نەوزاد ئەحمەد حسێن)ە..

ئەوە ماوەتەوە بڵێم ئەم دیوانۆچکەیە، لە ساڵی (2002)دا لەلایەن کۆمەڵەیەکەوە کە جوان نییە ناویان ببەم، پەیمانی چاپکردنی پێدرا، کەچی دوای وەرگرتنی ژمارەی سپاردن، پەیمانەکەیان توایەوەو بوو بە هەڵم.. هەربۆیە بە هەمان ژمارەی سپاردنەوەو بە هەندێ پارچە شیعری ترەوە، لەسەر ئەرکی خۆم وا بە چاپی ئەگەیەنم..

ن . أ . ح —
2005/7/11

# پێڕست

